**دەمی ئێستای سادە:**

a) دەمی ئێستای سادە بۆ وەسف کردنی کارێك بەکار دەهێنرێت کە بەردەوام لە ماوە دیاری کراوەکان دا دووپات دەبێتەوە یان وەك رەوشتی بکەری لێ‌هاتبێ. وەك:

ئەو هەموو رۆژێ دەچێتە قوتابخانە.

من هەموو حەوتوویەك رۆژنامەیەك دەکرم.

ئێمە هەموو مانگێك دەچینە سەیران.

ئەوان هەموو ساڵێك جلوبەرگی نوێ دەکرن.

رەنگە هەموو سەعاتێك، هەموو رۆژێك ، سێ رۆژ جارێك ، دوو ساڵ جارێك . . . دووپات ببنەوە.

b) ئەم دەمە بۆ بەیان کردنی راستیە هەمیشەیی‌و بەردەوامەکانیش بەکار دەهێنرێت یان ئەو راستیانەی بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوامن. وەك:

من قوتابیم. ئەوە کتێبە. ئەم خوێدانە خاڵی‌یە.

**چۆنیەتی دروست کردنی دەمی ئێستای سادە:**

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە پێویستە چاوگی فرمانی مەبەست "to"ی لێ هەڵبگرین‌و بەدوای بکەردا بەکاری بێنین. وەك:

I go to school every day. من هەموو رۆژێك دەچمە قوتابخانە.

We eat lunch at 12:30 ئێمە لە کاتژمێر ١٢,٣٠ نانی نیوەرۆ دەخۆین.

It is a book. ئەوە کتێبێکە.

I am a student. من خوێندکارێکم.

**سەرنج:**

لە دەمی ئێستای سادەدا هەرکات بمانەوێ فرمانەکان بۆ کەسی سێهەمی تاك بەکار بێنین دەبێ لە s یان es کەڵك وەرگرین. وەك:

She goes to school every day. ئەو هەموو رۆژێك دەچێ بۆ قوتابخانە.

He works here every week. ئەو هەموو حەوتوویەك لێرە کار دەکا.

بۆ ئەوەی بزانین فرمانەکان لە چ کاتێك s ولە چ کاتێك دا es وەردەگرن پێویستە پێڕەوی ئەو بناسایە بکەین کە بۆ کۆ کردنی ناوەکان لە خاڵەکانی "٢، ٣، ٤، ٥، ٦"دا باسی لێوە کراوە.

**فۆرمی نەرێ کردنی ئەم دەمە:**

بۆ نەرێ کردنی ئەم دەمە پێویستە لە فرمانی یاریدەدەری to do کەڵك وەربگرین.

To do دوو جۆر کەڵکی لێوەردەگیرێ هەرکات وەك فرمانی ئەسڵی بێت ئەوە مانای ئەنجام دان دەدات بەڵام هەرکات وەك فرمانی یاریدەردەر بێ هیچ مانایەکی تایبەتی نیەو تەنیا لەگەڵ فرمانی هاورێی بە رستەکە مانا دەبەخشێ.

لە رستە نەرێکاندا ئەم فرمانە لەپێش فرمانی ئەسڵییەوە دێو notی پێوە زیاد دەکرێ بەو شێوەیەی خوارەوە.

I don't go to school every day. — من هەموو رۆژێك بۆ قوتابخانە ناچم.

We don't eat lunch at 11:30. — ئێمە کاتژمێر ١١,٣٠ نەهار ناخۆین.

"don't کورتکراوەی do not کە زۆرجار ئەو بەکار دەهێنرێت.

لە فۆرمی نەرێدا بۆ کەسی سێیەمی تاك does not بەکار دەهێنرێت. کە کورتکراوەکەی (doesn't)ە . بەڵام هەرکات ئەم فرمانەمان لە رستەدا بەکار هێنا پێویستە فرمانە ئەسڵییەکان بۆ دۆخەکەی خۆی بگەرێنینەوە یانی ئەو بارە قورسەی لەسەر شانی فرمانە دەکەوێتە سەر شانی ئەم فرمانە یاریدەدەرە. وەك:

She *goes* to school. — ئەو دەچێت بۆ قوتابخانە.

نەرێکەی دەبێتە:

She doesn't *go* to school. — ئەو ناچێت بۆ قوتابخانە.

**فۆرمی پرسیاری و پرسیاری نەرێ:**

بۆ گۆرینی رستەکەمان بە پرسیاری پێویستە فرمانی یاریدەدەری do, does لە سەرەتای رستە، یانی لەپێش بکەردا بەکار بێنین. و ئەگەر پرسیاری نەرێ بێتnot یان لەگەڵدا بێت. وەك:

Don't I work? — ئایا من کار ناکەم؟

Doesn't she go to school? — ئایا ئەو ناچێ بۆ قوتابخانە؟

Do you see my brother? — ئایا تۆ براکەی من دەبینی؟

Does he drive every evening?

ئایا ئەو هەموو ئێوارەیەك ئوتومبیل لێدەخورێ؟

**سەرنج:**

هەرکاتێك یەکێك لەم فرمانە یاریدەدەرانە ( can , may , must , should , ought to) لە ڕستەیەك دا کە باس لە سێیەم کەسی تاك دەکات بەکاربهێنرێن نەك بۆ خۆیان s وەرناگرن بەڵکوو sی فرمانە ئەسڵییەکەش هەڵدەگرن، وە بۆ پرسیارو فۆرمی نەرێ خۆیان کارەکانی to do دەکەنو بەهیچ شێوەەك لەو جۆرە ڕستانەدا نابێ to do بەکار بهێنرێت. وەك:

She can speak English. ئەو دەتوانێ بە ئینگلیزی قسە بکات.

Can you speak English? ئایا تۆ دەتوانی بە ئینگلیزی قسە بکەی؟

I must work every day. من دەبێ هەموو ڕۆژێ کار بکەم.

## دەمی ئێستای بەردەوام (حال استمراری)

## The Present Continuos Tense :

ئەم دەمە بۆ بەیان کردنی ئەو حاڵانەی خواردوە بەکار دێ.

١-بۆ کارێك کە هەر ئێستا ئەنجام دەدرێو کۆتایی پێ نەهاتووە. وەك:

I am working. من خەریکی کار کردنم.

She is eating. ئەو خەریکی نان خواردنە.

You are reading. تۆ خەریکی خوێندنەوەی.

٢-بۆ باس کردنی ئەو بارودۆخەی کە بکەری تێدایە. بەواتایەکیتر بکەر خۆی هیچ کارێك ناکات، بەڵکوو حاڵەتەکەی باس دەکرێت.

She is siting. ئەو دانیشتووە.

I am listing. من گوێم گرتووە.

٣-دەتوانین ئەم دەمە بۆ داهاتووش بەکار بێنین. بەمەرجێك ئەو کارە لە داهاتوویەکی نزیك دا ئەنجام بدرێو بڕیاری ئەنجامی کاردکە پێشتر درابێت. وەك:

He is starting English next week.

ئەو حەوتووی داهاتوو دەست بە خوێندنی ئینگلیزی دەکات.

**شێوەی دروست کردنی دەمی ئێستای بەردەوام:**

بۆ دروست کرنی ئەم دەمە دەبێ چاوگی فرمانی مەبەست بێنین، بۆ نموونە: to work لەمیش دا (to)ەکەی لادەبەین پاشان ing پێوە زیاد دەکەین کە دەبێتە working. وە لە

پێشدا دەبێ سەرفکراوی فرمانی to be بەپێی کەسەکان بەکار بێنین. سەرفکراوی فرمانی to be بۆ کەسەکان بە شێوەی خوارەوەیە:

*بۆ دووەم کەسی تاك و سێ کەسەکە کۆکە are*
*بۆ سێیەم کەسی تاك is*
*یەکەم کەسی تاك am*

**شێوەی پرسیاری کردنی ئەم دەمە:**

بۆ پرسیاری کردنی تەنیا دەبێ سەرفکراوەکانی to be بێنینە پێش بکەرەوە لەسەرەتای ڕستەدا. وەك:

am I working? — ئایا من خەریکی کار کردنم؟
is it raining? — ئایا باران دەبارێ؟
are you going? — ئایا خەریکی بڕۆی؟

بۆ نەرێ کردن و پرسیاری نەرێ بەو شێوەی خواردوە کەڵك وەردەگرین:

I am not working. — من خەریکی کار کردن نیم.
isn't she eating? — ئایا ئەو خەریکی نان خوارن نیە؟
We are not reading. — ئێمە خەریکی خوێندنەوە نین.

هەروەك باسمان کرد ئەم دەمە بۆ کارێك کە هەر ئێستا بەرێوە دەچێ و کۆتایی پێنەهاتووە بەکار دەهێنرێت. بەڵام بۆ هێندێك کار کە ئەم دەمە بەکار دێنین و ڕەنگە لەکاتی قسەکردندا خەریکی ئەنجام دانی ئەو کارە نەبین. بەڵام لەپێش قسە کردندا و یان لەدوای ئەودا ئەو کارە بە بەردەوامی ئەنجام دەدەین. وەك:

(ئێمە بە بازاڕدا دەڕۆین، هاوڕێیەکمان تووش دەبێ و داوای کتێبێکمان لێ دەکات تا بیخوێنێتەوە، بەڵام ئێمە دەڵێین بۆ خۆمان خەریکین دەیخوێنینەوە). سەرنج بدەنە ئەو ڕستانەی خواردوە:

Please give me your English book. — تکایە کتێبی ئینگلیزیەکەتم پێ بدە.
I can't. — ناتوانم.
why? — بۆ چی؟
Because I am reading it. — چونکە خەریکم دەیخوێنمەوە.

لەو ڕستەی سەرەوەدا دیارە بکەر ئێستا و لەناو بازاڕدا کتێب ناخوێنێتەوە. بەڵام هەر کات وەختی هەبێ ئەو کارە دەکا.

**چەند خالێکی گرینگ:**

هەرکات بەدوای رستە فرماندەرەکان دا وشەکانی here ، there بێن لە جێی دەمی ـستای بەردەوام دەمی ئێستای سادە بەکار دەهێنرێ. وەك:

چاو لـێکە پیاوە بالاّ بەرزەکە دێ بۆ ئێرە.

Look! Here comes the tall man.

(دەتوانی بەو جۆرەش بەکاری بێنی.)

Look! The tall man is coming here.

هەرکات فرمانەکەمان بە e کۆتایی بێت eەکە لادەچێ و ing دەنووسرێ. وەك:

escape = escaping هەلاّتن　　write = writing نووسین

هەرکات ie لە کۆتایی فرمانەکەمان دا بێت لەکاتی ing وەرگرتن دا (ie) دەبێ بە (y). وەك:　die = dying مردن　lie = lying درۆ کردن

**ئەم فرمانانەش:**

feel بە مانای هەست پێکردن

Like بەمانای خۆش ویستن.

Taste بە مانای تام دان.

لەکۆتایی‌دا ing ناگرن. بەلاّم بە ماناکانی (دەست لـێدان، چێژ وەرگرتن، چێشتن) ing وەردەگرن.

I like my sister .

من خوشکەکەم خۆش دەوێ.　" ing ناگرێ"

I am liking the smell of perfumes.

من لە بۆنی عەترەکان چێژ وەردەگرم.　(ing دەگرێ)



## وشەکانی پرس Interrogative Words = Question Words:

بەو وشانە دەوترێ کە لە سەرەتای ڕستەیەك دا دێن و ڕستەکە دەکەنە پرسیاری کە گرنگترینیان بریتین لە:

***who, whom, which, which on, whose, what, when, what time, where, why, how, how much, how many, how old, how long, how often, how far.***

### شێوەی بەکارهێنانی ئەم وشانە لە ڕستەدا:

وشەی پرس هەموو کاتێك لە سەرەتای ڕستەدا بەکاردەهێنرێ و بەدوای ئەودا دەبێ لە فرمانی یاریدەدەری تایبەت بە دەمی ڕستەکە کەڵك وەرگرین. ئەگەر دەمی ئێستای سادە بوو لە do و does ئەگەر دەمی ئێستای بەردەوام بوو لە سەرفکراوی to be و بۆ دەمەکانی تریش هەربەو شێوەیە لە فرمانی یاریدەدەری تایبەت بە خۆیان کەڵك وەردەگرین.

هەرکات وشەکانی who, which , what جێگەی بکەریان گرتەوە بە دوایان دا فرمانی یاریدەدەر نایەت بەڵام کە جێگای کارلێکراو بگرنەوە دەبێ فرمانی یاریدەدەیان لەگەڵدا بێت.

Who gave you this book? *(لە جێی بکەر)* کێ ئەم کتێبەی پێ دایت؟

Who did you give this book?

Which student read the newspaper? *(لەجێی کارلێکراو)* ئەم کتێبەت بە کێ دا؟

*(لە جێی بکەر)* کام خوێندکار ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە؟

Which book do you use for learning English?

*(لە جێی کارلێکراو)* لە کام کتێب کەڵك وەردەگری بۆ فێربوونی ئینگلیزی؟

What fell there? *(لە جێی بکەر)* چی لەوێ کەوت؟

What did you fall? *(لە جێی کارلێکراو)* چیت خست؟

هەرکات فرمانەکە زێدەواژەی لەگەڵ بوو دەتوانین بە دوو شێوە بینووسین.

1- With whom did you go to movies? = 2- Whom did you go to movies with?

لەگەڵ کێ چوویت بۆ سینەما؟

**ڕستەی یەکەم "ئامریکایی"  ڕستەی دووەم "بریتانیایی"**

وشەی پرسی how long زیاتر بۆ دەمی ئێستای تەواو (ماضی نقلی) بەکار دەهێنرێت. وەك:

How long have you lived in this country?

چەند ساڵ ئەم وڵاتە ژیانت کردووە؟ یان ماوەی چەندە لەم وڵاتەدا ژیان دەکەیت؟

هەروەها how long بۆ پرسیار لە درێژایی شوێنێك بەكار دەهێنرێت. وەك:

How long is that wall? درێژایی ئەو دیوارە چەندە؟

لە ئینگلیزیدا هێندێك جار لە whence یان whither لەجێگای where كەڵك وەردەگیرێ. بەڵام ئەم وشانە زیاتر لە رابردوودا بەكارهێنراون. وەك:

Whither should they go? ئەوان دەبێ بۆ كوێ برۆن؟

Whence does she go? ئەو بۆ كوێ دەچێ؟

هەركات وشەی پرسی how far بە مانای تا كوێ بەكار بهێنرێت، پێویستە لە وشەی as far as بە مانای هەتا یان تا كەڵك وەربگرین. وەك:

How far did you go by car? هەتا كوێ بە ئوتومبیل چوویت؟

I went as far as Hawler by car. من تا هەولێر بە ئوتومبیل رۆیشتم.

لەو رستەی سەرەوەدا بەكارهێنانی till , until دروست نیەو نابێ لەو جۆرە رستانەدا بەكاریان بێنین.

هەركات هۆی ئەنجام دان یان ئەنجام نەدانی كارێك نەزانین پێویستە لە وشەی why كەڵك وەربگرین.

Why do you go to Muhabad? بۆچی دەچی بۆ مهاباد؟

Why don’t you eat your food? بۆچی نانەكەت ناخۆیت؟

بۆ وەڵام دانەوە بە پرسیارێك كە بە وشەی پرسی why دەستی پێ كردوە دەتوانین بەو شێوانەی خوارەوە وەڵام بدەینەوە.

why do you go to Muhabad? بۆچی دەچی بۆ مهاباد؟

**وڵامەكان:**

I go there <u>to see</u> my family. دەڕۆم بۆ ئەوەی بنەماڵەكەم ببینم.

I go there <u>in order to</u> see my family. دەڕۆم بۆ ئەوەی بە ئاسانی بنەماڵەكەم ببینم.

I go there <u>so as to</u> see them better. دەچم بۆ ئەوەی باشتر بنەماڵەكەم ببینم.

I go there <u>in order that</u> I can see them. دەچم بۆ ئەوەی بتوانم ئەوان ببینم.

I go there <u>so that</u> I can see them. دەچم بۆ ئەوەی بیان بینم.

I go there <u>because</u> I want to see them. دەچم چونكە دەمەوێ بیان بینم.

بە دوای so that, in order that بكەر لەگەڵ یەكێك لە فرمانەكانی can, could وە یان may , might, should بەكار دەهێنرێت.

***

## ئاوەڵفرمان Adverb:

ئاوەڵفرمان وشەیەکە کە بۆ وەسفی فرمان بەکار دەهێنرێ، یان بە واتایەکیتر هەر کاتێك بمانەوێ چۆنیەتی، کات، شوێن و ڕادەی بەڕێوەچوونی کارێك نیشان بدەین دەبێ لە ئاوەڵفرمانەکان کەڵك وەرگرین.

دەتوانین بڵێین ئاوەڵفرمان وشەیەکە کە وەسفی فرمان، ئاوەڵفرمانێکیتر یان ئاوەڵناو دەکا.

*نموونەکان:*

I speak English well. — من ئینگلیزی باش قسە دەکەم ( وەسفی فرمان ).

I speak English very well.

من ئینگلیزی زۆر باش قسە دەکەم ( وەسفی ئاوەڵفرمانێکیتر ).

She has a very beautiful dress.

ئەو کراسێکی زۆر جوانی هەیە (وەسفی ئاوەڵناو)

**لە ئینگلیزیدا چەند ئاوەڵفرمانمان هەیە کە بریتین لە:**

**١- ئاوەڵفرمانی دووپات بوونەوە adverb of frequency :**

ئەم ئاوەڵفرمانە دەری دەخات کە چەندە ئەنجامی کارەکەمان دووپات دەبێتەوە.

گرینگترین ئەم ئاوەڵفرمانانە ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| *usually* | *بە تەواوی – بە زۆری* |
| *som times* | *هێندێك جار* |
| *often* | *زۆر جاران* |
| *generally* | *بە بەردەوامی* |
| *occasionally* | *جاروبار (جارجارێك)* |
| *always* | *هەموو کاتێ* |
| *repeatedly* | *بە زۆری (زۆرجار)* |
| *never* | *هیچ کات* |
| *seldom* | *بە کەمی* |
| *hardly ever* | *زۆر بە کەمی* |
| *rarely* | *بە کەمی* |
| *frequently* | *بە زۆری* |

**شوێنی ئەم ئاوەڵفرمانانە لە ڕستەدا:**

ئاوەڵفرمانی دووپات بوونەوە لە ڕستەدا لە دوای بکەرو لە پێش فرمانی ئەسڵیدا دێت بەڵام هەرکات ڕستەکە فرمانی to be و فرمانە یاریدەرەکانی تێدا بوو دەکەوێتە دوای ئەوان.

I must always speak Kurdish. من دەبێ هەموو کات بە کوردی قسە بکەم.
I often see him. زۆر جاران دەیبینم.
Sometimes we speak English. حاری وا هەیە دەکەونە سەرەتا یان کۆتایی ڕستەوە.
We speak English sometimes. هێندێك جار بە ئینگلیزی قسە دەکەین.

هەرکات ئاوەڵفرمانی دووپات بوونەوە لە ڕستەیەك دا بێو هاوکات فرمانی یاریدەدەری ought to هاتبێ ئاوەڵفرمانەکە دەکەوێتە نێوان ought و زێدەواژەی to وەك:

You ***ought*** usually ***to*** work. تۆ دەبێ بە زۆری کار بکەیت.

**٢-ئاوەڵفرمانی حاڵەت (چۆنیەتی) Adverb of manner:**

بەو ئاوەڵفرمانانە دەڵێن کە چۆنیەتی ئەنجام دانی فرمان لە ڕستەدا وەسف دەکەنو بە گرینگترین جۆری ئاوەڵفرمان لە ئینگلیزیدا دادەنرێن.

ئەوەی بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم ئاوەڵفرمانە دەبێ بیزانین ئەوەیە کە لە کۆتایی بەشێکی زۆر لە ئاوەڵناوە سادەکان دا "ly" دادەنێینو ئاوەڵفرمانی لێ دروست دەکەین. وەك:

| | |
|---|---|
| bad خراپ | badly بە خراپی |
| slow هێواش | slowly بە هێواشی |
| quick خێرا | quickly بە خێرایی |
| greed چاوبرسی | greedly چاو برسیەتی |

They go slowly. ئەوان بە هێواشی دەڕۆن.
I drive the car quickly. من بە خێرایی ئوتومبیلەکە لێدەخورم.
We do our homework carefully. ئێمە بە وریاییەوە مەشقەکانمان دەنووسین.

**سەرنج:**

هێندێك لە ئاوەڵناوەکان کە بە "ly" کۆتاییان دێت بۆ دروست کردنی ئاوەڵفرمانی حالەت دەبێ لەم شێوازە کەڵك وەربگرین. (in a.........way) وەك:

He speak to me <u>in a</u> fatherly <u>way</u>.

ئەو بەشێوەیەکی باوکانە قسەی لەگەڵ مندا کرد.

**خاڵە گرینگەکان بۆ دروست کردنی ئاوەڵفرمانی حاڵەت:**

هەرکات ئاوەڵفرمانێك بە "y" کۆتایی هاتبێ‌و لەپێش ئەودا پیتێکی بێ‌دەنگ بێت (y) دەبێتە (i)و پاشان (ly) وەردەگرێت. وەکوو:

| | | | |
|---|---|---|---|
| angry | توورە | angrily | بە توورەیی |
| easy | ئاسان | easily | بە ئاسانی |
| happy | خۆش | happily | بە خۆشی |

هەرکات ئاوەڵناو بە (able, ible, ple) کۆتایی پێ بێت (e) لادەچێ‌و تەنیا( y ) بە کۆتاییەکەیەوە زیاد دەکرێ. وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| terrible | ترسێنەر | terribly | بە شێوەیەکی ترسێنەر |
| simple | ئاسان | simply | بە شێوەیەکی ئاسان |

هێندێك لە ئاوەڵناوەکان (ly) وەرناگرن‌و لەو یاسایە پێڕەوی ناکەن دیارە دەتوانین بڵێین ئەو وشانە کاری ئاوەڵناوو ئاوەڵفرمانیش دەکەن کە بریتین لە:

***Fast, hard, low, high, near, far, early, late, straight,***

وشەی hardly بە مانای (ناخۆش، بە زەحمەت) وەك barely لەو ڕستانەدا کە فرمانی یاریدەدەری canی تێدایە بەکار دەهێنرێت. وەك:

I can hardly speak English. من بە زەحمەت دەتوانم ئینگلیزی قسە بکەم.

هەرکات hardly لەگەڵ وشەی any بەکار بهێنرێت بە مانای (زۆر زۆر کەم) دێت.

I have hardly any money. من پارەیەکی زۆر زۆر کەمم هەیە.

وشەی hardly ever بە مانای (زۆر بە کەمی) دێت.

I hardly ever go out with her. من زۆر بە کەمی لەگەڵ ئەودا دەچمە دەرێ.

هەرکات وشەی hardly بەکار بێنین جێگاکەی پێش فرمانی ئەسڵییە لە حاڵێك دا، ئاوەڵفرمانی hard لە دوای فرمانی ئەسڵی بەکار دەهێنرێ‌و ئەوە خۆی پێناسەیەکە بۆ جیاوازی ئەم دوانە.

It was raining hard outside. لە دەرێ بە قورسی باران دەبارێ.

I can hardly wait for her. من بە زەحمەت دەتوانم چاوەڕێی ئەو بم.

وشەی lately بەرامبەر لەگەڵ recently بە مانای (ئەخیرەن، لەم ماوەیەدا)و زیاتر لە دەمی ئێستای تەواو بەکار دەهێنرێت.

I haven't seen him lately. لەم ماوەیەدا ئەم دیوە.

وشەی lowly ئاوەڵناوە لەگەڵ humble هاومانایە کە دەبێتە (خاکە ڕایی، بەکەم گر، خاکی).

My friend is a lowly young. هاوڕێکەم لاوێکی خاکەڕاییە.

وشەی highly پتر لە چوار چێوەیەك دا بەکاری دێنن. وەك:

She speaks highly of you.

ئەو هەڵسوکەوتی تۆی بەرز نرخاند( لە بارەی تۆوە بە باشی قسەی کرد).

وشەی nearly وەکوو ئاوەڵفرمان مانای almost دەدات کە مانای (پێم وایە) لە وردی دایە.

He is nearly ready. پێم وایە ئەو ئامادەیە.

**چەند نموونەیەك بۆ ئەو ئاوەڵفرمانانە کە وەك ئاوەڵناویش بەکار دەهێنرێن.**

A- This is a fast car. (*وەکوو ئاوەڵناو*) ئەمە سەیارەیەکی خێرایە.

B- This car goes very fast.

(*وەکوو ئاوەڵفرمان*) ئەم سەیارەیە زۆر خێرا دەڕوات.

C- I did hard work yesterday.

(*لە دۆخی ئاوەڵناودا*) دوێنێ کاری قورسم کرد.

D-I worked hard yesterday.

(*لە دۆخی ئاوەڵفرمان دا*) دوێنێ بە قورسی کارم کرد.

E- She married in her late twenties.

(*لە جێی ئاوەڵناو*) ئەو لە دواین ساڵی تەمەنی بیستەکانیدا ژیانی هاوبەشی پێك هێنا.

F- She married late.

(*لە جێی ئاوەڵفرمان*)ئەو درەنگ ژیانی هاوبەشی پێك هێنا.

لە ڕستەی (E)دا وەسفی ژمارەکە دەکات، یانی لە کۆتایی بیستەکان دا لەوانەیە لە ٢٧ بەرەو سەرێ بێت.

It is high wall. (*لە دۆخی ئاوەڵناودا*) ئەوە دیوارێکی بەرزە.

The planes fly high. (*لە دۆخی ئاوەڵفرمان دا*) تەیارەکان بەرز هەڵدەفڕن.

They speak in low voice. (*وەك ئاوەڵناو*) ئەوان بە دەنگێکی نزم قسە دەکەن.

Shakila sings low. (*وەك ئاوەڵفرمان*) شکیلا بە هێواشی گۆرانی دەڵێ.



**<u>Good – wel</u>** : وشەی good ناوەڵناوە well ناوەڵفرمانە:

She is a good girl. ئەو کچێکی باشە.

She speaks English very well. ئەو ئینگلیزی زۆر باش قسە دەکات.

لە دۆخێك دا well دەبێتە ناوەڵناو، ئەویش کاتێکە کە ئاماژە بـە حـاڵو تەندروسـتی کەسێك دەکات.

How is your sister? خوشکت چۆنە؟

She is well, thanks. باشە ، سوپا س

**<u>جێگای ئەم ناوەڵفرمانە لە ڕستەدا:</u>**

بۆ ئەوەی بزانین جێگای ئەم ناوەڵفرمانە لە کوێ دایە دەبێ ئەو خاڵانەی ژێرەوە لەبەرچاو بگرین.

a- هەرکات فرمانەکەمان تێنەپەڕ (لازم) بێت. ناوەڵفرمانی حاڵەت لەدوای ئەودا دێت . وەك:من بە هێواشی ئەچم بۆ قوتابخانە.

I go slowly to school.

b- هەرکات فرمانەکەمان تێپەڕ (متعدی) بێت. ناوەڵفرمانەکـە بـەدوای کـارلێکراودا دێت.

He broke my glasses angrily. ئەو بە تووڕەیی‌یەوە چاویلکەکەی منی شکاند.

هەرکات چاوگ لە دۆخی کارلێکراودا بەکار بهێنرێـت ناوەڵفرمـانی حاڵـەت راسـتەوخۆ بەدوای بکەردا دێت.

They greedily wanted to eat all of food.

ئەوان بە چاوبرسیەتی دەیانویست هەموو خواردنەکە بخۆن

هـەرکات وشـەی and بـۆ پێوەنـدی دانـی دوو رسـتە لـە نێوانیـان دا هاتبـێ دەبـێ ناوەڵفرمانی حاڵەت لـەدوای and بـەکار بێـنین یـان لـە کۆتـایی رسـتەکەوە و یـان and لادەبەین‌و لەجێگای ئەو دەی نووسین. وەك:

She looked at me <u>and</u> proceeded her way <u>quickly</u>.

ئەو چاوی لە من کردو بە خێرایی درێژەی بە ڕێگاکەی دا .

She looked at me <u>and</u> <u>quickly</u> proceeded her way.

She looked at me <u>quickly</u> proceeded her way

لە دوای فرمانەکانی ***look, seem, last , smell, appear, get, become,*** دەبێ ناوەڵناو بەکار بهێنرێ‌و بەکارهێنانی ناوەڵفرمان هەڵەیە. وەکوو:

He looks happy. ئەو دڵخۆش دێتە بەرچاو.

They got angry and went. ئەوان تووڕە بوون‌و رۆیشتن.

### چۆنیەتی پێوانە كردنی ئاوەڵفرمانی حاڵەت:

ئاوەڵفرمانەكان هەروەك ئاوەڵناو بەپێی پلە دابەش دەكرێن:

a- **پلەی سادە:**

كە تەنیا ئاوەڵفرمانەكە بەكار دەهێنرێت بۆ وەسف كردنی فرمان لە رستەدا.

b- **پلەی نێونجی (تفضیلی):**

بۆ بەراورد كردنی ئەنجامی فرمانێك لە كەسێك یا شتێك بۆ كەسێك یان شتێكی ...كە. بۆ دروست كردنیلە وشەی more كەڵك وەردەگیرێو بەدوایدا زێدەواژەی than ...ادەنێین. وەك:

I drive more quickly than you (do).

من لە تۆ خێراتر لێدەخورم.

c- پلەی بەرز (عالی): بۆ بەراورد كردنی لەنێوان چەند كەسێك یا شتێك، بۆ دروست ...ردنی دەبێ لە most و ئامرازی ناساندنی دیار the كەڵك وەرگرین. وەكوو:

I drive the most quickly of all.

من لە هەمووان خێراتر لێدەخورم.

ئەو وشانە پێڕەوی لەو یاسایە ناكەنو بۆ پلەكانی نێونجیو بەرز most , more ناگرن ...ەبریتین لە:

| Well | باش | Better | باشتر | The best | ...اشترین |
|---|---|---|---|---|---|
| far | دوور (بۆ رێگا) | Farther | دوورتر | Thefarthest | ...ورترین |
| far | زۆر | Further | زۆرتر | Thefurthest | [illegible] |
| Badly | خراپ | Worse | خراپتر | Theworst | [illegible] |
| Late | دردنگ | Later | دردنگ تر | The latest | ...ترین |
| fast | خێرا | faster | خێراتر | The fastest | [illegible] |
| hard | قورس | harder | قورس تر | Thehardest | [illegible] |

## پێوانەکردنی بەرانبەری ئاوەڵفرمانی حاڵەت:

لەم دۆخەدا هەروەك ئاوەڵناو لەم شێوەیە ( as........as) کەڵك وەردەگرین.

I go as slowly as he does. من هەرودك ئەو بە هێواشی دەڕۆم.

She doesn't speak as well as I do. ئەو وەکوو من باش قسە ناکا.

هەرکات وشەی best لە دۆخی ئاوەڵفرمانی حاڵەت دا لە کۆتایی ڕستەوە بەکار بێنرێت. پێویست بە the ناکات.

He drives best. ئەو لە هەمووان باشتر لێدەخوڕێ.

## ئاوەڵفرمانی شوێن Adverb of Place:

پێشتر باسی ئاوەڵفرمانەکانی دووپات بوونەوەو حالەتمان کرد، بەکێکیتر لە ئاوەڵفرمانەکان، ئاوەڵفرمانی شوێنە کە نیشاندەری ئەو شوێنو جێیەیە کە فرمانەکەی تێدا ئەنجام دراوە. شوێنی ئەم ئاوەڵفرمانە لە ڕستەدا لەدوای کارلێکراو و پێش ئاوەڵفرمانی کاتە.

I go to school at 7:30. من سەعات ٧,٣٠ دەڕۆم بۆ قوتابخانە.

I come there at night. من شەو دێم بۆ ئەوێ.

## ئاوەڵفرمانی کات Adverb of Time:

ئەم ئاوەڵفرمانە کاتی ڕوودانی کارێك لە ڕستەدا نیشان دەدات گرینگترنیان لە ئینگلیزیدا ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| the day before yesterday. | پێرێکە |
| today | ئەمڕۆ |
| the day after tomorrow. | دووسبەی |
| yesterday | دوێنێ |
| tomorrow | سبەینێ |
| last night | دویشەو |
| tonight | ئەمشەو |
| every day | هەموو ڕۆژێ |
| every other day | ڕۆژنارۆژێ |

شوێنی ئەم ئاوەڵفرمانانە لە کۆتایی ڕستەدایە، بەلاّم هەرکات بمانەوێ تەکید لە کات بکەین دەبێ لە سەرەتای ڕستەوە بەکاری بێنین.

I see her every other day. من ڕۆژنارۆژێ دەی بینم.

The day before yesterday I saw her. پێرێکە دیم (بینیم).

**ناوەڵفرمانی نادیاری شوێن:**

ئەم ناوەڵفرمانانە کە بریتین لە nowhere , anywhere, somewhere باس لەو شوێنانە دەکەن کە بەشێوەیەکی نادیار لە ڕستەدا بەکار دەهێنرێن. چۆنیەتی بەکارهێنانیان لە ڕستەدا بەو شێوەی خوارەوەیە:

***Somewhere*** لە ڕستەی ئەرێدا (affirmative) بەکار دەهێنرێت.

***Anywhere*** لە ڕستەی نەرێدا (negative) و پرسیاری interrogative بەکار دەهێنرێت.

***Nowhere*** لە ڕستە ئەرێکاندا بەکار دەهێنرێت و مانای نەرێ بە ڕستەکە دەدات.

***نموونەکان:***

| | |
|---|---|
| I want to go somewhere today. | ئەمڕۆ دەمەوێ بۆ شوێنێ بچم. |
| do you want to go anywhere today? | ئەتەوێ ئەمڕۆ بچی بۆ شوێنێ؟ |
| I don't want to go anywhere. | نامەوێ بچم بۆ شوێنێ. |
| I want to go nowhere? | یان: |

## دەمی ڕابردووی سادە The Simple Past Tense:

دەمی ڕابردووی سادە بۆ باس کردن لە کارێك بەکار دەهێنرێت، کە لە ڕابردوودا دەستی پێکردوە و لە ڕابردووش دا کۆتایی پێهاتووە. لەم حاڵەتەدا پێویستە کاتی ئەنجام دانی ڕووداوەکە بەیان بکرێت. وەك:

"من دوێنێ چووم بۆ سەیران." لێرەدا دەردەکەوێ کە بکەر وێڕای ئەوە کارەکەی کە ڕۆیشتن بۆ سەیرانە ئنجام داوە کۆتایی بە کارەکەیش هێناوە یانی "هاتۆتەوە" و کاتەکەیشی دیارە کە دوێنێیە.

I went to picnic yesterday.

هەروەها لەو ڕستانەدا کە بەدوای یەکدا دێن بۆ وێنە لە وتارێکدا یان باسێك لەسەر شتێك پێویستە ئاوەڵفرمانەکانی کات لە ڕستەی یەکەم دابنێین و ڕستەکانی‌تر پێویستیان پێی نیە.

I went to picnic yesterday. My friends were there, I saw them and we talked together.

دوێنێ چووم بۆ سەیران هاوڕێکانم لەوێ بوون من ئەوانم بینی و ئێمە بەیەکەوە قسەمان کرد.
هەروەك لەو ڕستانەی سەرەوەدا دەبینرێ تەنیا یەك جار لە ئاوەڵفرمانی کات کەڵك وەرگیراوە.

**شێوەی دروست کردنی دەمی ڕابردووی سادە:**

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە گرینگترین شت کە پێویستە باس بکرێ "فرمانە". Verb
لە ئینگلیزیدا فرمانەکان بە دوو جۆر دابەش دەکرێن :

١-فرمانە یاسایەکان Regular Verb

٢-فرمانە بێ یاساکان Irregular Verb

لەبەشی یەکەم دا یانی فرمانە یاسایەکان بۆ کردن بە ڕابردوو پێویستە لە کۆتایی ئەوانەوە d,ed زیاد بکرێ. وەکوو:

work = worked    finish = finished    like = liked

بەشی دووەم کە بە فرمانە بێیاساکان ناسراون هیچ یاسایەکی تایبەتو دیاریکراویان نیەو بەهۆی ئەوەوە کە گرینگیەکی تایبەتییان هەیە لە ئینگلیزیدا دەبێ لەبەر بکرێن.

go = went    write = wrote    eat = ate    read = read

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە دەبێ دەمی ڕابردووی فرمان (یاسای یان بێیاساکان) لەدوای بکەر بەکار بهێنرێت. وەك:

I <u>worked</u> hard yesterday.    من دوێنێ بە قورسی کارم کرد.

They <u>***wrote***</u> their homework last night.

ئەوان دوێنێ شەو دەرسەکانیان نووسییەوە.

**شێوەی نەرێ کردنی ڕستەکان لەم دەمەدا:**

بۆ نەرێ کردنی ڕستەکەمان هەروەك لە دەمی ئێستای سادەدا باسمان کرد، دەبێ لە فرمانی to do کەڵك وەربگرین. دیارە بۆ ئەم مەبەستەش دەمی ڕابردووی ئەم فرمانە بەکار دێنین کە فرمانی to do سەر بە فرمانە بێیاساکانە.و دەمی ڕابردووەکەی دەبێتە did جیاوازییەکەی کە لەگەڵ دەمی ئێستا کەی هەیەتی ئەوەیە کە بۆ هەموو کەسەکان بەم شێوەیە سەرف دەکرێ. دیارە لەدوای did بۆ دروست کردنی فۆرمی نەرێ دەبێ not بەکار بێنین. وەك:

I didn't <u>***work***</u> hard yesterday.    من دوێنێ بە قورسی کارم نەکرد.

She didn't <u>***write***</u> their home work last night

ئەو دوێنێ شەو دەرسەکەی نەنووسی.

هەروەك دەبینرێ ڕستەی سەرەوە چ فرمانە یاسایەکەو چ بێ یاسا کە گەڕاوەتەوە سەر دۆخی خۆیان یانی چاوگی بێ to بەهۆی ئەوە فرمانی یاریدەدەریان لەگەڵ دایە. لەو حاڵەتەدا نابێ دەمی ڕابردووی فرمان بنووسرێ.

**شێوەی پرسیاریی و پرسیاریی نەرێ:**

بۆدروست کردنی پرسیاریی و پرسیاریی نەرێ دیسان دەبێ لە "didn't" did کەڵك وەربگیرێ ئەم وشەیە لە سەرەتای ڕستەدا دێ و فرمان دەگەڕێتەوە سەر دۆخی چاوگی بێ to.

وەکوو:

Did you ***work*** yesterday? ئایا دوێنێ کارت کرد؟

Didn't she ***write*** her homework, last night?

ئایا ئەو دوێنێ شەو مەشقەکەی نەنووسی؟

***خاڵێکی دیکە بۆ بەکارهێنانی ئەم دەمە:***

هێندێك جار ئەم دەمە بۆ کارێك بەکار دەهێنرێ کە ئەو کارە لە ڕابردوودا بە بەردەوامی دووپات بۆتەوە بەڵام، ئێستا کە باسی لێوە دەکرێ ئەو کارە دووپات نابێتەوە یان بە واتایەکیتر بۆ کارێك کەڵکی لێوەردەگیرێ کە ئەو کارە لە ڕابردوودا ڕەوشتی بکەر بووەو ئێستا ئەو ڕەوشتە بۆ بکەر نەماوە. وەکوو:

He got up at 6:00 every day. ئەو هەموو ڕۆژێ سەعات ٦ لەخەو هەڵدەستا.

لەو ڕستەیەدا (هەستان خووی بکەر بووە لە ڕابردوودا)و ئێستا کە باسی لێوە دەکەین ئەو خووەی نەماوە.

***هێندێك خاڵی گرینگ:***

بۆ دانانی d ,ed لە کۆتایی فرمانە یاساییەکانەوە دەبێ ئەو خاڵانە لەبەرچاو بگرین.

*هەرکات فرمانەکەمان بە e کۆتایی بێت بە کۆتاییەکەیەوە d زیاد دەکەین.

وەك: retire = retired like = liked

*هەرکات فرمانەکە بە (t,p) کۆتایی پێ هات لە کۆتاییدا ed دەگرێ و وەك سیلابێکی جیاواز idی دەخوێندرێتەوە.

وەکوو: add = added - attempt = attempted

*هەرکات وشەکەمان بە (p, ch,sh) کۆتایی پێ هات ed وەردەگرێ و بە (t) دەخوێندرێتەوە. وەکوو: pass = passed - finish = finished

*هەرکات فرمانەکە بە y کۆتایی پێ بێت و لەپێش ئەودا پیتی بێدەنگ بێ y دەبێتە (i). وەکوو: try = tried - carry = carried

*هەرکات لەپێش y پیتی دەنگدار بێ تەنیا ed لە کۆتاییدا دادەنرێ.وەکوو:

play = played - guy = guyed

## دەمی ڕابردووی بەردەوام The Past Continuous Tense:

دەمی ڕابردووی بەردەوام بۆ بەیانکردنی کارێك بەکار دەهێنرێ کە لە ڕابردوودا درێــژەی کێشاوە بەمەرجێ کاتی درێژەی کار کە دیاریکراو بێ یان دیار بێ کە کارەکــە لــە چ کاتێکـدا درێژەی کێشاوە، بۆئەوەی زیاتر لەو بارەیەوە بزانین دوو شێوەمان هەیــە بــۆ درێــژەی ئــەنجامی کارەکە.

١-کاتە ئەسڵییەکان: وەك . دوێنێ، حەوتووی پێش، پارەکەو . . .هتد.

Last night    8 p.m.    9 p.m.    10 p.m.    now

١---------------------١

What are you doing last night? دوێنێ شەو خەریکی چی بووی؟

I was watching TV (I started watching before 8:00 and continued after 9:00)

من دوێنێ شەو خەریکی چاو لە تەلەفزیۆن کردن بووم "یانی لەپێش سەعاتی ٨ دەستم پێ‌کردو تا دوای سەعات ٩ درێژەم پێدا"

هەروەك لەو هێمای سەرەوەدا دیارە درێژەی کاتەکە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەرکەوتووە.

٢-بەکارهێنانی ڕستەیەکی ڕابردووی سادە هاوکات لەگەڵ ڕستەیەکی ڕابردووی بەردەوام.

When you called, I was watching TV.

کاتێك تۆ تەلەفۆنت کرد من چاوم لە تەلەفزیۆن دەکرد

### شێوەی دروست کردنی دەمی ڕابردووی بەردەوام:

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە چاوگی فرمانی مەبەست دێنین to دەکەی لێ‌هەڵدەگرین بە کۆتاییەکەیەوە ing زیاد دەکەین پاشان سەرفکراوی فرمانی to be بۆ ڕابردوو کە دەبێتە were , was لەپێش فرمانەکەوە دێنین لەدوای بکەرەوە دایان دەنێین.وەك:

I was reading the newspaper last night.

من دوێنێ شەو خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامە بووم.

We were working when you came there

کاتێك تۆ هاتی بۆ ئەوێ ئێمە خەریکی کارکردن بووین.

**سەرفکردنی فرمانی to be بۆ کەسەکان لە ڕابردوودا بەم شێوەیە.**

| | |
|---|---|
| I was | we were |
| you were | you were |
| (she, he, it) was | they were |

**فۆرمی نەرێ :**

بۆ دروستکردنی فۆرمی نەرێ تەنیا not لەبەر was, were دادەنرێ. وەك:

I wasn't reading the newspaper last night.

من دوێنێ شەو خەریکی خوێندنەوەی رۆژنامە نەبووم.

We weren't working when you came there.

کاتێك تۆ هاتی بۆ ئەوێ ئێمە خەریکی کارکردن نەبووین.

**فۆرمی پرسیاری و پرسیاری نەرێ:**

بۆ دروست کردنی ئەم فۆرمە تەنیا لە هێنانە پێشەوەی wereو was بۆ پرسیاریو weren't و wasn't بۆ پرسیاری نەرێ کەڵك وەردەگرین. وەکوو:

Was she reading the book last night?

ئایا ئەو دوێنێ شەو خەریکی کتێب خوێندنەوە بوو؟

Weren't they working when we came there?

ئایا کاتێك ئێمە هاتین خەریکی کارکردن نەبوون؟

**خاڵێکی گرینگ:**

هەرکات دوو ڕستەی ڕابردووی سادە، بەردەوام بەیەکەوە هاتن وشەی (کاتێك، کاتێك دە) دەکەوێتە نێوانیان کە لە هەر سێ وشەی when, while, as کەڵك وەردەگیرێ.

وشەی when زیاتر دەکەوێتە پێش ڕستەی ڕابردووی سادەوە، وشەکانی whileو as دەکەونە پێش ڕابردووی بەردەوام. (دەکرێ بە پێچەوانەیش بێت بەڵکوو زۆر بە کەمی) وەك:

When you called me, I was watching TV.

While I was watching TV, you called me.

As I was watching TV, you called me.

(کاتێك تۆ تەلەفونت بۆ من کرد، خەریکی چاو لە تەلەفزیۆن کردن بووم)

"هەرسێکیان یەك مانایان هەیە"

*دەتوانین جێگای ڕستەکانیش بگۆڕین بەڵام لەم حاڵەتەدا (,) لادەچێ.

I was watching TV when you called me.

You called me while I was watching TV. هەر مانای ڕستەکانی پێشوو دەدەن.

دەتوانین بڵێین هەرکات when هاوکات لەگەڵ ڕستەیەکی ڕابردووی سادەدا بێت (بەمەرجێك when وەك ئاوەڵفرمانی لکاو "قید ربط" بەکار بهێنرێ ) ڕستەی دوای ئەو یان ڕابردووی بەردەوامە یان ڕابردووی دوورە.

لەپاش as کاتێك بە مانای (چونکە، لەبەرئەوەی) بەکاربهێنرێ دەتوانین لە رابردووی دوور یان بەردەوام کەڵك وەربگرین. وەکوو:

As she was reading her lesson, I couldn't talk to him.

لەبەرئەوەی خەریکی خوێندنەوەی وانەکەی بوو، من نەمتوانی لەگەڵیدا قسە بکەم.

وشەکانی پێوەندی (لکاو)ی "Conjunction": (then, until, and) ئەم وشانە هەرکات بەکار بهێنرین دوو رستەی هاوکات بەیەکەوە دەبەستنەوە. وەك:

She didn't sleep until I came home.

هەتا من هاتمەوە ماڵێ ئەو نەخەوت.

He ate his breakfast then he went to school.

ئەو نانی بەیانی‌یەکەی خوارد ئەوجا چوو بۆ قوتابخانە.

He ate his breakfast and left the house.

ئەو نانی بەیانی‌یەکەی خواردو ماڵێی بەجێ هێشت.

**سەرنج:**

هەروەك باسمان کرد رابردووی بەردەوام بۆ کارێك بەکار دەهێنریت کە لە رابردوودا درێژەی بووبێت. لێرەدا جیاوازی‌یەك لەنێوان رابردووی سادەو بەردەوام دا هەیە. لە رابردووی سادەدا کارێك باس دەکرێت کە لە رابردوودا دەستی پێ‌کردبێت. وە هەر لە رابردووش دا کۆتایی پێ‌هاتبێت بەڵام، لە رابردووی بەردەوام دا لەسەر درێژەی ئەنجامدانی کارەکە تەکید دەکرێ‌و گرنگی بە کۆتایی کارەکە نادرێت.

بەگشتی کۆتایی کار لەم دەمەدا لەبەرچاو ناگیرێ‌و ئەوەی دەمانەوێ تەکیدی لەسەر بکەین درێژەی کارەکە لە رابردوو دایە.

When he ate lunch, I arrived. کاتێك ئەو نەهاری خوارد من گەیشتم.

When I arrived, he was eating lunch.

کاتێك من گەیشتم ئەو خەریکی نان خواردن بوو.

لەو دوو رستەی سەرەوەدا دیارە تەکید لەسەر کام بەش دەکرێ، لەوەی سەرەوە تەکید لەسەر کات دەکرێ کە کاتی گەیشتن دیاری دەکا. بەڵام لە رستەی خوارەوەدا گرینگی دەدات بە ئەنجامی کارەکە کە نان خواردنە.

هەروەك بۆ رابردووی سادەش باسمان کرد کە ئەو دەمە هێندێك جار بۆ کارێك بەکار دەهێنرێ کە ئەو کارە لە رابردوودا دووپات بۆتەوە. بەڵام ئێستا دووپات نابێتەوە بۆ ئەم کارە دەتوانین لە دەمی‌رابردووی بەردەوامیش کەڵك وەربگرین.

## بەکارهێنانی used to:

هەروەك لە سەرەوە باسمان کرد دەتوانین بۆ ئەو کارانەی کە لە رابردوودا دووپات بوونەتەوە و یان وەك رەوشتی بکەری لێهاتووە. بەڵام ئێستا ئەو رەوشتانە نەماون لەهەردووك رابردووی سادەو بەردەوام کەڵك وەردەگرین.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە خاڵێکی دیکە بکەین، لە ئینگلیزیدا هێندێك جار لە جێی هەر دووك ئەم دەمانە لە فرمانی used to کەڵك وەردەگیرێ. وەك:

He used to get up at 6:00 every day last year .

He was getting up at 6:00 every day last year.

He got up at 6:00 every day last year.

ئەو پارەکە هەموو رۆژێ سەعاتی شەش لەخەو هەڵدەستا. "هەر سێ رستەکە یەك مانایان هەیە"

**بۆ پرسیار کردن :**

Did he use to get up at 6:00 last year?

ئایا ئەو پارەکە سەعات شەش لەخەو هەڵدەستا؟

## Question Tag – Short Question (پرسیاری کورت (کلکە پرسیار)

لە قسەکردنی رۆژانە لە زمانی ئینگلیزیدا زۆرجار لە شێوەیەك کەڵك وەردەگرن بۆ پرسیار کردن کە question tagی پێ دەڵێن.

شێوەی بەکارهێنانی ئەم جۆرە پرسیارە بەو شێوەیە:

هەرکات رستەکەمان ئەرێ بوو ئەوە لە کۆتایی رستەکەوە بەکەڵك وەرگرتن لە فرمانی یاریدەدەری تایبەت بە دەمی رستەکە فۆرمی کورتە پرسیار بە شێوەی نەرێ بەکار دەهێنین و ئەگەر نەرێ بوو بە پێچەوانەی نەرێ بەکار دەهێنین. وەك:

You are a student, aren't you? — تۆ خوێندکاریت، وانیە؟

He writes a letter, doesn't he? — ئەو نامە دەنووسێ، وانیە؟

They went home yesterday, didn't they? — ئەوان دوێنێ چوون بۆ ماڵێ، وانیە؟

She has lived here for ten years, hasn't she?

ئەو بۆ ماوەی دە ساڵ لێرە ژیاوە، وانیە؟

**(یان بە پێچەوانەوە)**

You aren't a student, are you? — تۆ خوێندکار نیت، وایە؟

He doesn't writes a letter, does he? — ئەو نامە نانووسێ، وایە؟

They didn't went home yesterday, did they?

ئەوان دوێنێ نەچوون بۆ ماڵێ، وایە؟

She hasn't lived here for ten years, has she?

ئەو بۆ ماوەی دە ساڵ لێرە نە ژیاوە، وایە؟

هەروەك دەبینرێ بۆ هەركام لە دەمەكان فرمانی یاریدەدەر تایبەت بە خۆیان بەكار هێنراوە لەپێش ئەم فۆرمە دانانی"," هەروەك دیاریكراوە زۆر پێویستە وە فرمان دەبێ لەپێش بكەردا بێت.

## ڕێكەوتن لەگەڵ ڕستە هەواڵییەكان Agreement to the Statement:

هەركاتێك لەلایەن بكەرێكەوە كارێك لە ڕستەیەكدا ڕوویدات و بمانەوێ ئەو كارە پێوەند بدەین بە كەسێكیترەوە لە فرمانی یاریدەدەری دەمی ڕستەكەو وشەكانی ( neither, either, too, so) بەو شێوەی ژێرەوە كەڵك وەردەگرین.

### ڕستە ئەرێكان : Positive Sentences

He went to school and <u>so did I</u>. ئەو چوو بۆ قوتابخانە هەروەها منیش چووم.

He went to school and <u>I did too.</u> "هەردووكمان رۆیشتین بۆ قوتابخانە"

He goes to school and so do I.

ئەو دەچێ بۆ قوتابخانە هەروەها منیش دەچم. "هەردووكمان دەڕۆین بۆ قوتابخانە"

He goes to school and I do too.

### ڕستە نەرێكان : Negative Sentences

He doesn't go to school and neither do I.

He doesn't go to school and I don't either.

١) ئەو ناچێ بۆ قوتابخانە هەروەها منیش ناڕۆم.

٢) "هەردووكمان ناچین بۆ قوتابخانە"

He didn't go to school and neither did I..

He didn't go to school and I didn't either .

١) ئەو نەرۆیشت بۆ قوتابخانە هەروەها منیش نەرۆیشتم

٢) "هەردووكمان نەچووین بۆ قوتابخانە"

هەروەك دەبینرێ هەركات neither بەكار بهێنرێ فرمانی یاریدەدەری هاوڕێی (positive)ەو هەركات either بەكار بهێنرێ فرمانی یاریدەدەرەكەی (negative)ە .

<u>چەند نموونەیەکی‌تر :</u>

1- You were a teacher and so was she.

تۆ مامۆستا بوویت‌و هەروەها ئەویش بوو.

2- You weren't at university and she wasn't either.

تۆ لە زانکۆ نەبوویت هەروەها ئەویش نەبوو.

*لە وەرگێرانی ئەم ڕستانەدا جوان نیە وشە بە وشە بەو شێوەی سەرەوە بەکاریان بێنین بۆیە جوانتر ئەوەیە بەم شێوەیە بەکاریان بێنین:*

*١) تۆیش و ئەویش مامۆستا بوون.*

*٢) هیچ کامتان لە زانکۆ نەبوون (نە تۆ نە ئەو لە زانکۆ نەبوون).*

---

## فرمانەکـــان
## :Verbs

هەروەك لە سەرەتای دەمەکان دا باسمان کرد فرمان یەکێك لە گرنگترین خاڵەکانی ڕێزمانی ئینگلیزییە هەروەك دەزانین فرمانەکان بە دوو جۆر دابەش دەکرێن فرمانە بێ‌یاساکان‌و فرمانە یاسایی‌یەکان.

فرمانە بێ‌یاساکان بەو فرمانانە دەڵێن کە لە کاتی سەرف کردنیان بۆ هەر کام لە دەمەکان پێرەوی یاسایەکی تایبەت ناکەن.

هەر فرمانێك کە لە چاوگ سەرچاوە ئەگرێ بۆ دروست کردنی دەمەکان ئاڵوگۆری بەسەردا دێ کە بریتی‌یە لە: (چاوگ، ڕابردوو، ناوی کارلێکراو).

*infinitive چاوگ - past tense دەمی ڕابردوو - past participle ناوی کارلێکراو*

هەرکام لەم بەشانە گرینگی‌یەکی تایبەتیان هەیە بۆ وێنە فرمانی to go بەو شێوەیە سەرف دەکرێ. *(to go چاوگ) (went ڕابردوو) (gone ناوی کارلێکراو)*

فرمانە یاسایی‌یەکان ئەوانەن کە لە دەمی ڕابردوودا و ناوی کارلێکراودا d, ed دەگرن. *(to work چاوگ) (worked ڕابردوو) (worked ناوی کارلێکراو)*

***دیسان دێینەوە سەر فرمانە بێ‌یاساکان بەپێی ئەو ژمارەیەی کە لە (Oxford Advanced Learner's Dictionary) ساڵی ٢٠٠٠ دەرچووە ژمارەی ئەو فرمانانە لەو فەرهەنگەدا دەگاتە ٢٢٧ دانە. کە بەشێکیان زۆرترین کەڵکیان لێ‌وەردەگیرێ. دیارە بێ‌یاساکانیش خۆیان بە چەند جۆر دابەش دەکرێن.***

١-ئەو فرمانانەی کە هەرسێ بەشەکەیان یەکێکە. وەك:

| | چاوگ | ڕابردوو | ناوی کالێکراو |
|---|---|---|---|
| (لێدان) | hit | hit | hit |
| (خوێندنەوە) | read | read | read |

٢-ئەو فرمانانەی کە دەمی ڕابردوو و ناوی کارلێکراو یان یەکێکە.

| | چاوگ | دەمی ڕابردوو | ناوی کالێکراو |
|---|---|---|---|
| (وتن) | say | said | said |
| (ناردن) | send | sent | sent |

٣-ئەو فرمانانەی کە چاوگ‌و ناوی کارلێکراویان یەکێکە:

| | چاوگ | دەمی ڕابردوو | ناوی کالێکراو |
|---|---|---|---|
| (هاتن) | come | came | come |
| (بوون) | become | became | become |

٤-ئەو فرمانانەی هەر سێ بەشەکەیان جیاوازە.

| | چاوگ | دەمی ڕابردوو | ناوی کالێکراو |
|---|---|---|---|
| (خواردن) | eat | ate | Eaten |
| (نووسین) | write | wrote | written |

بۆ فرمانە یاسایەکان لەپێش دا باسمان کرد ed, d دەگرن.

## فرمانە یاریدەدەرەکان The Auxiliary Verbs:

لە ئینگلیزیدا چەند فرمانێکمان هەیە کە بە فرمانی یاریدەدەر ناسراون کە بریتین لە:
to be, to do, to have, can, may, must, shall, will, should, would, ought to, to need, to dare, used to.

هەروەك دەبینرێ لەپێش هێندێك لەو فرمانانەی سەرەوە نیشانەی چاوگ (to) دانەنراوە. لەبەرئەوەی ئەو فرمانانە هەر سێ بەشەکەیان نیەو بە فرمانە ناتەواوەکان دەناسرێن.

لەپێش دا بەکورتی باسی فرمانەکانی to do‌و to be مان کرد، ئێستا درێژە بە باسەکە دەدەین. فرمانە یاریدەدەرەکانی to be, to do, to have, to need, to dare وێڕای ئەوەی وەك فرمانی یاریدەدەر بەکار دەهێنرێن دەتوانین وەك فرمانی ئەسڵیش کەڵکیان لێوەرگرین.

### ١-فرمانی یاریدەدەری to be:

ئەم فرمانە هەرکات وەك فرمانی ئەسڵی بێت مانای (بوون) دەدات بەڵام، وەك فرمانی یاریدەدەر مانایەکی تایبەت بە خۆی نیەو تەنیا بۆ دیاری کردنی دەمی ڕستەکە بەکار دەهێنرێ سەرفکراوی ئەم فرمانە بەو شێوەیە.

| چاوگ | دەمی ئێستا | | دەمی ڕابردوو | | ناوی کارلێکراو |
|---|---|---|---|---|---|
| to be | am | بۆ کەسی یەکەمی تاك | was | بۆ کەسی یەکەمو سێیەمی تاکو | been |
| | is | بۆ کەسی سێیەمی تاك | were | بۆ کەسی دووەمی تاکو کۆکان | |
| | are | بۆ کەسی دووەمی تاکو کۆکان | | | |

فرمانی to be لەگەڵ هەموو ڕستە بەردەوامەکان (استمراری) continuos کە بریتین لە (دەمیئێستای بەردەوام، ڕابردووی بەردەوام، ئێستای تەواویبەردەوام، ڕابردووی دووری بەردەوامو داهاتووە بەردەوامەکانو هەموو فرمانە نادیارەکان (فعل مجهول) بەکار دەهێنرێ.

### فرمانی to do:

ئەم فرمانە هەروەك باسمان کرد فرمانێکی یاریدەدەرەو دەتوانین وەك فرمانی ئەسڵیش بەکاری بێنین کە مانای (ئەنجام دان) دەدات ئەم فرمانە هەرکات وەك یاریدەدەر بەکار بهێنرێ مانایەکی تایبەت ناداتو تەنیا بۆ فۆرمەکانی پرسیاریو نەرێ لە دەمەکانی ڕابردوو و ئێستای سادە بەکار دەهێنرێ. سەرفکراوی ئەم فرمانە بریتی‌یە لە:

| چاوگ | دەمی ئێستا | | دەمی ڕابردوو | | ناوی کارلێکراو |
|---|---|---|---|---|---|
| to do | | بۆ هەموو کەسەکان | did | بۆ هەموو کەسەکان | done |
| | do | بێجگە لە کەسی سێیەمی تاك | | | |
| | dose | بۆ سێیەم کەسی تاك | | | |

فرمانی to do بۆ تەکید لە بەرێوەچوونی کارێك لە ڕستەی نەرێدا بەکار دەهێنرێت وەك:

I know you didn't eat your food.

من دەزانم تۆ خواردنەکەت نەخوارد.

But I _did_ eat. بەڵام من خواردم.

## فرمانی to have :

ئەم فرمانە هەرکات وەك فرمانی ئەسڵی بەکار بهێنرێ مانای (هەبوون، خواردن) دەدات بەڵام لە ڕستەکانی (ئێستای تەواو- ئێستای تەواوی بەردەوام- ڕابردووی – ڕابردووی دووری بەردەوام – هێندێك لە ڕستە داهاتووەکانو ڕستە مەرجییەکان) وەك فرمانی یاریدەدەر بەکار دەهێنرێو مانایەکی تایبەتی نیە تەنیا جۆری دەمەکە دیاری دەکات.

**سەرفکراوەکانی بریتین لە:**

| چاوگ | | دەمی ئێستا | دەمی ڕابردوو | ناوی کارلێکراو |
|---|---|---|---|---|
| | | بۆ هەموو کەسەکان | بۆ هەموو کەسەکان | "بۆ هەموو کەسەکان" |
| **have** | have | جگە لە کەسی سێیەمی تاك | had | had |
| | has | تەنیا بۆ کەسی سێیەمی تاك | | |

شتێك کە پێویستە لەسەر ئەم فرمانە بزانرێ ئەوەیە : هەرکات وەك فرمانی ئەسڵی بەکاربهێنرێ (بە تایبەت لە شێوازی ئەمریکا) پێڕەوی لە یاسای فرمانەکانی دیکە (ئەسڵییەکان) دەکات یانی بۆ نەرێو پرسیاری فرمانی تایبەت بە دەمی ڕستەکە وەردەگرێ. وەك:

| | |
|---|---|
| I have two books. | من دوو کتێبم هەیە. |
| Do you have two books? | ئایا تۆ دوو کتێبت هەیە؟ |
| She has a car. | ئەو سەیارەیەکی هەیە. |
| Does she have a car? | ئایا ئەو سەیارەی هەیە؟ |
| They had a good teacher. | ئەوان مامۆستایەکی باشیان هەبوو. |
| They didn't have a good teacher. | ئەوان مامۆستایەکی باشیان نەبوو. |

هەروەك دەبینرێ هیچ جیاوازییەك بۆ ئەم فرمانە لەگەڵ فرمانەکانی دیکەدا دانانرێ بەڵام ( لە شێوازی بریتانیا) لە have got بە مانای (هەبوون) کەڵك وەردەگرن کە زۆرجار لەجێی فرمانی یاریدەدەر بەو شێوەیەی خوارەوە بەکاری دێنن. وەك:

| | |
|---|---|
| They have got a wonderful house. | ئەوانماڵێکی زۆر خۆشیان هەیە. |
| They haven't got a house. | ئەوان ماڵیان نیە. |

دیاره زۆرجار لە شێوازەکەی دیکەیش کەڵك وەردەگیرێ بەتایبەت لە رەوشت و هەڵسوکەوتی رۆژانە لەهەردووك ولات لەم شێوازە کەڵك وەردەگیرێ. وەك:

We don’t have time to talk. — ئێمە وەختمان نیە قسە بکەین.

Do you ever have headache ? — ئایا تۆ سەر ئێشە دەگری؟

## فرمانی یاریدەدەری to need :

بە مانای (پێویست بوون) بەکار دەهێنرێ ئەم فرمانەیش بە دوو شێوە بەکار دەهێنرێ هەم وەك فرمانی یاریدەدەرو هەم وەك ئەسڵی کە لە هەردوو شێوەدا هەر ئەو مانایەی سەرەوەی هەیە. بەڵام لە بەکارهێنان دا جیاوازیان هەیە. کە بریتییە لە:

**١-وەك فرمانی یاریدەدەر بەو شێوەیە بەکار دەهێنرێ.**

a-فرمانێك کە بەدوای دادێ to ناگرێ.

b-بۆ پرسیار کردن خۆی دێتە پێش بکەرەوە .

c-بۆ نەرێ تەنیا not بەدوای دادێ.

d-بۆ سێیەم کەسی تاك لە دەمی ئێستای سادەدا S وەرناگرێو فرمانی دوای خۆیشی بێ S بەکار دەهێنرێ. وەك:

You need go to school. — پێویستە برۆی بۆ قوتابخانە.

Need you go to school? — ئایا پێویستە برۆی بۆ قوتابخانە؟

He need not go to school. — پێویست ناکات بروات بۆ قوتابخانە.

**٢-وەك فرمانی ئەسڵی بەو شێوەیە بەکار دەهێنرێت.**

a-فرمانێك کە بەدوایدا دێت to دەگرێ.

b-بۆ پرسیار کردن و فۆرمی نەرێ دەبێ لە فرمانی یاریدەدەر کەڵك وەرگرین.

c-وەك فرمانە ئەسڵییەکان بۆ کەسی سێیەمی تاك (دەمی ئێستای سادە) S وەردەگرێ.

I need to speak to her. — پێویستە لەگەڵیدا قسە بکەم.

I don’t need to speak to her. — پێویست ناکات قسەی لە گەڵدا بکەم.

She needs money. — ئەو پێویستی بە پارەیە.

Does she need money? — ئایا ئەو پێویستی بە پارەیە؟

**سەرنج:**

یەکێك لە گرینگترین خاڵەکان بۆ بەکارهێنانی ئەم فرمانە ئەوەیە کە: هەرکات وەك فرمانی یاریدەدەر لە دەمی رابردوودا بەکاری بێنین دەبێ بە دوای ئەودا لە فۆرمی (ناوی کارلێکراو+have) کەڵك وەرگرین. بەڵام هەرکات وەك فرمانی ئەسڵی بەکاری بێنین لە فرمانی یاریدەدەری did کەڵك وەردەگرین‌و مانای دوو رستەکە بە تەواوی جیاوازیان لەگەڵ یەکدا هەیە. وەك:

You needn't have gone there last night (but you did) .

پێویستی نەدەکرد کە دوێنێ شەو بچی بۆ ئەوێ(بەڵام چووی).

You didn't need to go there last night (so you didn't) .

پێویستی نەدەکرد کە دوێنێ شەو برۆی بۆ ئەوێ(کەواتە نەچووی).

لەو دوو رستەی سەرەوەدا جیاوازییەکی بەرچاو دەبینرێ، لە رستەی سەرەوە بە پێچەوانەی مەبەست کارەکە رووی داوە بەڵام لە رستەی خوارەوەدا هەروەك مەبەستمان بوود، کارەکە بەرێوە چووە.

## فرمانی یاریدەدەری to dare:

ئەم فرمانەیش بە دوو شێوەی یاریدەدەر و ئەسڵی کە لە هەردووکیان مانای (بەغیرەت بوون، غیرەت کردن) دەدات بەو شێوانەی خوارەوە لە رستەدا بەکار دەهێنرێ.

**١-وەك فرمانی ئەسڵی:**

a –لە کەسی سێیەمی تاك دا لە دەمی ئێستای سادە s ناگرێ‌و sی فرمانی دوای خۆیشی لادەبا.

b-بۆ پرسیار کردن دێتە پێش بکەرەوە.

c-بۆ فۆرمی نەرێ تەنیا not وەردەگرێ.

d-فرمانی دوای ئەو چاوگی بێ to دەبێ. وەکوو:

غیرەت دەکەم قسەی لەگەڵدا بکەم. I dare talk to her.

ئایا غیرەتی هەیە بە خێرایی لێی‌خوڕێ؟ Dare he drive quickly?

*زۆرجار لە رستە ئەرێ‌کان دا بە مانای نەترسان دێت. وەك:*

من ناترسم راستی‌یەکەی پێ‌بڵێم. **I dare not to tell her the truth.**

**٢-وەك فرمانی ئەسڵی:**

لەم دۆخەدا هەموو ئەو تایبەتمەندیانەی فرمانە ئەسڵی‌یەکانی هەیە. وەك:

ئەو غیرەت دەکا (ناترسێ) بە خێرایی لێ‌خوڕی. He dares to drive quickly.

ئایا غیرەتت هەبوو ئەم قسەیە بکەی؟ Did you dare to say this?

### فرمانی ناتەواوی :can

ئەم فرمانە کە بە مانای (توانین) دێت فرمانێکی یاریدەدەرە و لە عەینی حاڵدا ناتەواوە چونکە هەرسێ بەشەکەی نیە ئەم فرمانە تەنیا بۆ دەمی ئێستا و ڕابردوو بەکار دەهێنرێو بۆ دەمەکانی دیکە ناتوانین کەڵکی لێوەرگرین. دەمی ڕابردووەکەی could.

ئەم فرمانە بۆ هەموو کەسەکان وەك یەك سەرف دەکرێ.

بۆ سێیەم کەسی تاك لە دەمی ئێستای سادەدا s وەرناگرێو sی فرمانی دوای خۆیشی لادەبا.

### شێوەی بەکارهێنانی لە ڕستەدا:

١-*بۆ ئیزن وەرگرتن* *Permission :*

دەتوانم ئوتومبیلەکەت لێخورم (ئیزنم ئەدەی)؟ can I drive your car?

٢-*هێزو توانا* *Ability:* *کە دوو بەشە:*

**a-هێزی جەستەی**

**b-توانای فکری**

a-هێزی جەستەیی Physical Ability:

I can't lift this stone but she can.

من ناتوانم ئەم بەردە هەڵگرم بەڵام ئەو دەتوانێ.

b-توانای فکری Mental Ability:

He can plan for his future. ئەو دەتوانێ پلان بۆ داهاتووی دارێژێ.

**Could** هەروەك باسمان کرد دەمی ڕابردووی فرمانی canە بەڵام هێندێك جار لە دەمە ئێستاکان دا جێگای can دەگرێتەوە. لەو جۆرە ڕستانەدا کە زیاتر بۆ ئیزن وەرگرتن یان داوای کارێك لە گوێگر بەکار دەهێنرێ شێوازێکی ماقوولانە (بە ئەدەب) ترە.

Could I drive your car? دەتوانم سەیارەکەت لێخورم (بە شێوەیەکی ماقوڵانە).

Could you give me that book? دەتوانی (دەکرێ) ئەو کتێبەم پێ بدەی؟

### سەرنج:

هەرکات ڕستەیەك ئاماژە بە ڕابردوو بکاتو لە دوای could لە فۆرمی (ناوی کارلێکراو+have) کەڵك وەرگیرابێ. دەریدەخا کە بکەر دەیتوانی کارێك بکات بەڵام بە هۆیەك نەی کردووە (ئەنجامی نەداوە) بەڵام ئەگەر بە پێچەوانە بێت یانی بکەر توانیبێتی کارێك بکاو کردوویەتی لە فۆرمی could و بەدوایدا چاوگی بێ to کەڵك وەردەگرین.

*1-She could have spoken to us.* ***ئەو دەیتوانی قسەمان لە گەڵدا بکات (بەلام نەیکرد).***

*2-She could speak to us.* ***ئەو توانی قسەمان لە گەڵدا بکا (کردی).***

لە ڕستەی( 1 )دا بکەر دەیتوانی قسە بکات بەڵام نەیکردووە بۆیە بەو شێوازە ڕستەکە دارێژراوە بەڵام لە ڕستەی(2)دا توانیویەتی قسە بکاو کردوشیەتی.

**خاڵێکی گرینگ:**

**هەروەك پێشتر باسمان کرد فرمانی can فرمانێکی ناتەواوەو تەنیا بۆ دەمی ئێستا و ڕابردوو دەتوانین کەڵکی لێوەرگرین ئەوەیش بەو هۆیەوە کە ئەم فرمانە (ناوی کارلێکراو) (اسم مفعول) past participle ی نیە و بۆ دروست کردنی دەمەکانی ڕابردووی دوور، ئێستای تەواو، داهاتووەکان بەکار ناهێنرێ.**

بۆ ئەم مەبەستە پێویستە لە فرمانێك کەڵك وەربگرین کە لە مانادا وەك ئەو بێتەوە لە ئینگلیزیدا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە لە فرمانی to be able to کەڵك وەردەگیرێ کە بەپێی دەمی ڕستەکە فرمانی ( **to be**)کەی سەرف دەکرێ. وەك:

She will <u>be</u> able to come here.

ئەو دەتوانێ بێت بۆ ئێرە. (داهاتوو)

They have <u>been</u> able to lived there for ten years.

ئەوان توانیویانە بۆ ماوەی ١٠ ساڵ لەوێ ژیان بکەن. "*ئێستای تەواو*"

**فرمانی ناتەواوی Must:**

ئەم فرمانەش هەروەك فرمانی can لە ڕستەکاندا بەکار دەهێنرێ یانی تەنیا دەتوانی وەك فرمانی یاریدەدەر بەکاری بێنی جیاوازییەك کە لەگەڵ can هەیەتی ئەوەیە کە can بۆ ڕابردوو بەکار دەهێنرێ بەڵام must تەنیا دەمی ڕانەبردووی هەیەو بۆ هیچ دەمێکی دیکە بەکار ناهێنرێ.

**فرمانی must بۆ هەموو کەسەکان وەك یەك سەرف دەکرێ و شێوەی بەکارهێنانی بەو جۆرەیە:**

**١-تۆبزی (زۆر) Obligation:**

You must go now. دەبێ ئێستا برۆی.

لەم فۆرمەدا بۆ پرسیار کردن مانای (پێویست بوون) دەدات. وەك:

Must you go now? ئایا پێویستە دەکا ئێستا برۆی؟

۲-پێویستی Necessary:

لەم شێوازەدا مانای (دەبێ‌یان پێویستە) دەدات. وەك:

You must go quickly if you want to get in time.

ئەگەر دەتەوێ لەسەر کاتدا بگەیت دەبێ بە خێرایی بڕۆیت

*هەروەك دەبینرێ لەهەردوو خاڵدا بە مانای (دەبێ) لە زمانی کوردیدا بەکار دەهێنرێ بەڵام "دەبێ" لە خاڵی (1) وەك فرمانێك لەلایەن قسەکەرەوە بەیان دەکرێ بەڵام لە خاڵی (2) وەك پێویستی‌یەك باسی لێوە کراوە.

۳-بڕوا Inference :

لەم جۆرەش دا هەر بە مانای (دەبێ یان پێم وایە) دێت کە بە شێوازێك بەیان دەکرێ کە تێگەیشتنی کەسێك لە شتێك دەردەخا.

کوردستان دەبێ وڵاتێکی خۆش بێ.

Kurdistan must be a nice region.

لەم فۆرمەدا دەتوانین بۆ دەمی رابردوو بەو شێوازە کەڵك وەربگرین (ناوی‌کالێکراو+must have) . وەکوو:

She must have gone last night. ئەو دەبێ دوێنێ شەو رۆیشتبێ.

**سەرنج:**

هەرکات بمانەوێ لەم فرمانە بۆ دەمەکانی دیکە کەڵك وەرگرین دەبێ لە فرمانی have to یان to have got to کەڵك وەربگرین کە هاومانای (must)ە.

| ناوی کارلێکراو و دەمی رابردوو | دەمی ئێستا | چاوگ |
|---|---|---|
| بۆ هەموو کەسەکان | have to (جگە لە سێیەم کەسی تاك) | to have to |
| had to | have got to بۆ هەموو کەسەکان | to have got to |
| | has to, has got to ( بۆ کەسی سێیەمی تاك )ە | |

**نموونەکان:**

You must go now = You have to go now = You have got to go now.

دەبێ ئێستا بڕۆی . ( هەر سێ رستەکە یەك مانایان هەیە.)

She has to come here = She has got to come here = She much come here.

ئەو دەبێ بێت بۆ ئێرە.

She had to come there. ئەو دەبوایە بهاتایە بۆ ئەوێ.

- بۆ پرسیارو فۆرمی نەرێ پێویستە لە فرمانی یاریدەدەری تایبەت بە دەمی ڕستەکە کەڵك وەرگرین.

Does she have to come here? ئایا ئەو دەبێت بێ بۆ ئێرە؟

Did they have (got) to speak to him?

ئایا دەبوایە ئەوان قسەیان لەگەڵدا بکردایە؟

***جیاوازیەکی کەم لەنێوان ئەو دوو فرمانەدا:***

هەرکات هەردوو ئەو فرمانانە لە دەمی ئێستادا بەکار بهێنرێن جیاوازیەکی بچووك لە نێوانیاندا هەیە (ئەم شێوازە لە بریتانیا باوە) فرمانی must بۆ قسەکردن لەبارەی شتێکەوە بەکار دەهێنرێ کە داخوازی قسەکەر یان گوێگر بێت بەلاّم have (got) to بۆ یاساو بڕیارەکان یان داخوازەکانی خەڵکانیتر بەکار دەهێنرێ. وەك:

**I would love to stay, but I must go now I have got to visit my teacher this evening.**

**من پیم خۆشە بمێنمەوە بەلاّم دەبێ بڕۆم من دەبێ مامۆستاکەم ئەم ئێوارەیە ببینم.**

※لەو ڕستانەی سەرەوەدا لەو بەشەدا کەmust بەکارهێنراوە نیشاندەری ئەوەیە کە بڕیارەکە بۆ خۆی داویەتی بەلاّم لەو بەشەی کە have got to بەکار هێنراوە بڕیارەکە لەلایەن مامۆستاکەوەیە کە دەبێ بکەر جێبەجێی بکات.

**خاڵێکـــی گرینگ:**

هەروەك لە خاڵی دووەمی شێوەی بەکارهێنانی ئەم فرمانەدا باسمان کرد بۆ پێویستیەك بەکار دەهێنرێ کە لەپێش دا باسی لێوە کراوە. بۆئەم شێوازە لە فۆرمی نەرێدا هێندێك یاسا هەیە کە دەبێ لەبەرچاو بگیرێن.

**Must not** تەنیا لە کاتێك دا بەکار دەهێنرێ‌کە نیشاندەری یاساو فرمانو یان هەڕەشە کردنو قەدەغە کردنی لە بەڕێوەچوونی کارێك بێت. وەك:

You must not talk to him any more.

تۆ ئیتر نابێ قسەی لەگەڵدا بکەی.(بە توندی)

She must not do that. ئەو نابێ ئەو کارە بکات (ڕێی پێنادرێ) "بە توندی"

*ئەگەر بڕیارەکە وەك ئەوەی سەرەوە توند نەبێ پێویستە لە فرمانی need not کەڵك وەربگرین.*

She needn't do that. ئەو پێویست ناکات ئەو کارە بکات.

You needn't talk to him any more. پێویست ناکات ئیتر قسەی لەگەڵدا بکەی.

## فرمانی ناتەواوی May:

ئەم فرمانە مانای (دەکرێ) لە زمانی کوردیدا دەداتو بۆ ئیجازە وەرگرتنو ئیمکانی بەرێوەچوونی کارێك کەڵکی لێوەردەگیرێ. وەکوو:

May I go now? دەکرێ ئێستا برۆم؟

She may see you. لەوانەیە (ئیمکانی هەیە) کە ئەو بتبینێ.

لە راستیدا might وەك دەمی رابردووی may ناسراوە بەڵام بۆ بەکارهێنانی چەند یاسایەك هەیە پێویستە لەبەرچاویان بگرین.

هەرکات رستەکەمان ئاماژە بە رابردوو بکات دەبێ ئەم یاسایە بەکار بهێنرێ.

(ناوی کاڵێکراو + may have) بەکار بهێنرێ. وەك:

She may have seen you. لەوانەیە (ئیمکانی هەیە) تۆی دیبێت.

لەم جۆرە رستەیەدا دەتوانین لە might کەڵك وەرگرین بەمەرجێ ئیمکانی بەرێوەچوونی کارەکە زۆر زۆر کەم بێت.

She might have seen you. لەوانەیە تۆی دیبێ (ئیمکانی زۆر زۆر کەمە)

**دەتوانین لە might بۆ رستە ناراستەوخۆکان بەو شێوەیە کەڵك وەرگرین.**

She said that she might see you. ئەو وتی ئیمکانی هەیە تۆی دیبێت.

هەرچەند might رابردووی (may)ە بەڵام دەتوانین لە دەمی ئێستایش دا کەڵکی لێوەرگرین. لەم حاڵەتەدا ئیمکانی زۆر زۆر کەمی بەرێوەچوونی کارێك رادەگەیەنێ.

He may get there in time, I hope so.

ئیمکانی هەیە لەسەری وەخت دا بگات.هیوادارم

He might get there in time, but I can't be sure.

ئیمکانی هەیە لەسەری وەخت دا بگات بەڵام ناتوانم دڵنیا بم.

بۆ ئیجازە وەرگرتنیش زۆرجار might بەکار دەهێنین کە ماقووڵانەترە و ئەدەبێکی زۆرتر لەلایەن قسەکەردوە بەرامبەر بە گوێگر دەردەخا.

May I take your book? دەکرێ کتێبەکەت بەرم؟

Might I take your book? دەکرێ (بۆم هەیە) کتێبەکەت بەرم؟(ماقوڵانەتر)

**فرمانەکانی will - shall:**

ئەم دوو فرمانە بۆ دروست کردنی دەمە داهاتووەکان بەکار دەهێنرێن. وەك:

You will be in time if you hurry. ئەگەر پەلە بکەی لەسەری کات دا دەگەیت.

This time next week I shall be in London.

حەوتووی داهاتوو ئەم کاتە لە لەندەن دەبم.

*دەتوانین لە will بۆ (بانگهێشت کردن، داخوازی) کەڵك وەربگرین.*

Will you come my home tomorrow? دەکرێ سبەینێ بێی بۆ ماڵی من؟

Will you take this book? دەکرێ ئەم کتێبە لەگەڵ خۆت بەری؟

**جیاوازییەکانی ئەم دوو فرمانە:**

لەئینگلیزی نوێدا زۆر بەکەمی shall بەکار دەهێنرێ‌و لە شێوازی ئەمریکاییدا تەنیا بۆ کەسی یەکەم تاك‌و کۆ (I, we) بەکار دەهێنرێ ئەویش بەشێوەیەکی رەسمییەو زۆر کۆنەو ئێستا خەڵك زۆرتر لە will بۆ ئەو کەسانەش کەڵك وەردەگرن. بەلاّم لە شێوازیبریتانیادا خەڵك لە shall بۆ کەسەکانی یەکەمی تاك‌و کۆ(I, we) کەڵك وەردەگرن بەتایبەت کاتێك پێشنیار دەکەن‌و رای کەسێکی دیکە وەردەگرن.

Shall we order a glass coffee? دەتوانین داوای پەرداخێك قاوە بکەین؟

What shall I wear to the party? بۆ میوانی چی لەبەر بکەم؟

فرمانی will لە رستەدا زۆرجار کورت دەکرێتەوە بە ('ll)و فۆرمی نەرێکەی won't و فرمانی shall کورت ناکرێتەوە بەلاّم فۆرمی نەرێکەی (shan't)ە.

If you don't mind, I shan't order coffee.

ئەگەر بە لاتەوە گرینگ نیە من داوای قاوە ناکەم.

They won't lend us any more money.

ئەوان ئیتر پارەی زۆرمان بە قەرز پێ نادەن.

It'll rain tomorrow. سبەینێ باران دەبارێ.

**فرمانەکانی should, would:**

فرمانی should رابردووی (shall)ە و فرمانی would رابردووی( will)ە ئەم دوو فرمانە بۆ دروست کردنی دەمەکانی داهاتوو لە رابردوو future in the past بەکار دەهێنرێن.

**فرمانی would بۆ ئەو مەبەستانەی خوارەوە بەکار دەهێنرێن:**

١-لە دەمی ئێستای سادەدا ئەم فرمانە خوازیارێکی ماقوڵانە لە گوێگرە. وەك:تکایە دەکرێ ئەو فەرهەنگەم پێبدەیت؟
Would you take me that dictionary?

٢-would like لە جێگای want بەکار دەهێنرێ.

Would you like to drink the tea. چایەکە دەخۆیتەوەز(مەیل دەکەی).

Do you want to drink the tea. دەتەوێ چایەکە بخۆیتەوە.

٣-بۆ دروست کردنی رستە مەرجی‌یەکان کەڵکی لـێوەردەگیرێ. وەك:

If I had money, I would lend you some.

ئەگەر پارەم ببوایە بڕێکم بەقەرز دەدایتێ.

**فرمانی should بۆ ئەو مەبەستانە بەکار دەهێنرێ:**

١-وەك ئەرکێك کە پێویستە جێبەجێ بکرێ.

You should pay your debts. تۆ دەبێ (پێویستە) قەرزەکانت بدەیتەوە.

٢-وەك ئامۆژگاری بۆ گوێگر:

You should eat more fruit. تۆ دەبێ میوەیەکی زۆرتر بخۆیت.

ئەو دوو خاڵانەی سەرەوە بۆ دەمەکانی ئێستا، داهاتوو بەکار دەهێنرێن بـەڵام هـەرکات بمانەوێ کارێك کە دەبوایـە لـە رابـردوودا ئـەنجام بدرایـەو ئـەنجام نـەدراوە.پێویـستە فـۆرمی should have لەگەڵ ناوی کالێکراو بەکار بێنینو یان بە پێچەوانە دەبوایە ئەنجام نەدرایـەو ئەنجام دراوە دیسان هەر لەو فۆرمە کەڵك وەردەگرین. وەك:

You should have seen him. تۆ دەبوایە بتدیایە. (بەڵام نەیبینیوە)

You shouldn't have seen him. تۆ نەدەبوایە بتدیتبایە. (بەڵام بینیوتە)

**فرمانی ought to:**

ئەم فرمانە زۆرجار لە جێگای should بەکار دەهێنرێ. وەك:

You ought to pay your debts. تۆ دەبێ (پێویستە) قەرزەکانت بدەیتەوە.

*بۆ پرسیارو فۆرمی نەرێ بەو جۆرە بەکار دەهێنرێ.

Ought I to write a letter to him? ئایا دەبێ نامەیەکی بۆ بنووسم؟

You oughtn't to say that. تۆ نابێ ئەو قسەیە بکەی.

## فرمانی یاریدەدەری Used to :

لەپێش دا باسی ئەم فرمانەمان کردووە کە لە رابـردوودا بـەکار دەهێنـرێو نیشـاندەری رەوشتو خووی بکەر بووە کە لە رابردوودا ئەنجامی داوە بەلآم ئێسـتا ئـەو رەوشـتە نـەماوەو کارەکە بەرێوە ناچێ. ئێستاش باسی چەند خالێکی گرینگ لەو پێوەندیەدا دەکەین.

فرمانی دوای used to هەموو کات چاوگی بێ toو تەلەفوزی ئەم وشەیە (یوست)ە.

*چەند نموونەیەك:*

She used to go to the movies regularly.

ئەو بە بەردەوامی دەچووە سینەما ( ئێستا ناچێ)

I didn’t use to go to the movies every day.

من هەموو رۆژێ نەدەچووم بۆ سینەما.

### :to be used to

ئەم فرمانە جیاوازی لەگەلّ used to دا هەیە لەدەمی ئێستا بـەکاردەهێنرێو فرمـانی دوای خۆی هەموو کات ***ing*** وەردەگرێ.

She is used to going to the movies every day.

ئەو فێرە هەموو رۆژێ بچێ بۆ سینەما.

We are used to eating a lot. ئێمە فێرین زۆر بخۆین.

### :To get used to

ئەم فرمانە وەك هەموو فرمانە ئەسلّیەکان لە ئینگلیزیدا بـەکار دەهێنـرێو فرمـانی دوای خۆی ing وەردەگرێ.

You will get used to living in this city. تۆ فێری ژیان کردن لەم شارە دەبی.

### : Used to

ئەم فرمانە جیاوازیەکی زۆری لەگەلّ ئەوانەی سەرێ هەیەو دەبێ ئەو جیاوازیە لەبەرچاو بگیرێ. ئەم فرمانە مانای (کەلّك وەرگرتن، بەکارهێنان) لە کوردیدا دەداتو دەمی رابـردووو ناوی کالێکراوی( used)ە کە خوێندنەوەکەی (یوزد)ە.

Zagross grammar is used for learning English.

ڕێزمانی زاگرۆس بۆ فێربوونی ئینگلیزی بەکار دەهێنرێ.

I always use this book. من هەموو کات کەلّك لەم کتێبە وەردەگرم.

**دەمی ئێستای تەواو (ماضی نقلی)**

## : The Present Perfect Tense

لە درێژەی دەمەکان دا نۆبە دەگاتە دەمی ئێستای تەواو پێشتر باسی دەمەکانی ئێستاو رابردووی سادەو بەردەوامان کرد.

دەمی ئێستای تەواو بە یەکێك لە گرنگترین دەمەکان لە زمانی ئینگلیزیدا بەهۆی بەکارهێنانی لەلایەن زۆرینەی خەڵکیئینگلیزی زمان و شێوەی بەکارهێنانی بە بەربلاوی دەناسرێ.

هەروەها جیاوازی بەکارهێنانی دەمی ئێستای تەواو ئەوەندە وردو گرینگە کە زۆرجار دەبێتە هۆی هەڵە لە دروست کردنی رستەدا. ئەم دەمە بۆ چەند خاڵی جیاواز بەکار دەهێنرێ کە بریتین لە:

١-بۆ بەیان کردنی کارێك کە لە رابردوودا دەستی پێکردوە و لە رابردووش دا کۆتایی هاتووە بەڵام کاتی ئەنجام دانی کارەکە نادیارە.

جیاوازیەك کە لەم شێوازەدا لەگەڵ رابردووی سادە هەیە، ئەودیە کە لە رابردووی سادەدا کاتی ئەنجام دانی کارەکە دیارە بەڵام لە ئێستای تەواو دیار نیە.

They have not lived all over the world.

ئەوان لە هەموو دنیا ژیانیان نەکردوە.

٢-بۆ کارێك بەکار دەهێنرێ کە لە رابردوودا دەستی پێکردوەو تا ئێستا بەردەوام دووپات دەبێتەوە. لەم شێوەیەدا ئیمکانی هەڵە کردنی لەگەڵ ئێستای سادەدا هەیە. بەڵام دەمی ئێستای سادە بۆ کارێك بەکار دەهێنرێ کە لە کاتە دیاریکراوەکاندا دووپات دەبێتەوە وپێوەندی بە دەست پێکردن یان کۆتایی کارەکەوە نیە بەڵام ئێستای تەواو بۆ کارێك بەکار دەهێنرێ کە رابردووەکەی دیارەو بە بەردەوامی دووپات بۆتەوە.

He has come here for ten days. ئەو بۆ ماوەی دە رۆژە دێت بۆ ئێرە.

٣-بۆ بەیان کردنی حاڵەتی بکەر کە لە رابردووەوە دەستی پێکردوو تا ئێستا درێژەی کێشاوە یان دووپات بۆتەوە.

They have worn that clothes for two months.

بۆ ماوەی دوو مانگە ئەو جلوبەرگەیان لەبەردایە.

٤-بۆ کارێك کە لە رابردوودا دەستی پێکردووەو لە رابردووش دا کۆتایی پێهاتووە بەڵام کاتی ئەنجام دانی کارەکە (ئەو دەمەی کارەکەی تێدا ئەنجام دراوە) هێشتا کۆتایی

پێنەهاتووە. ئەم خاڵە یان بڵێین شێوازە لە کەمتر زمانێکی دنیادا باوەو تەنیا لە زمانی ئینگلیزیدا بەزۆری کەڵکی لێوەردەگیرێ. بۆ ئەم شێوازە لە ناوەڵفرمانەکانی کات وەك :
*this week, this morning, today* کەڵك وەردەگرن.

شێوەی بەکارهێنانی ئەم جۆرە وەك:

7 8 9 10 11 12 1 2 3 4 5

نێستا

I have written a letter this morning. من ئەم بەیانییە نامەیەکم نووسیوە.

هەروەك دیارە کارەکەمان لە رابردوودا (سەعات ٨) دەستی پێکردووەو هەر لە رابردوودا (سەعات ١٠) کۆتایی پێهاتوە بەڵام ئەو کاتەی باسی دەکەین this morning کۆتایی پێنەهاتووە بەو مانایە ئەو کاتەی ئێمە قسەکە دەکەین (سەعات ١١)یەو هێشتا بەیانییە. بەڵام ئەگەر سەعات لە ١٢ تێپەری دەبێ بەو جۆرە بنووسرێ: یان لە رابردووی سادە کەڵك وەردەگرین‌و یان بە گۆڕینی ئاوەڵفرمانی کات هەر بەو شێوەی سەرەوە باسی دەکەین.

I wrote a letter this morning. من ئەم بەیانییە نامەیەکم نووسی.

I have written a letter today . من ئەمڕۆ نامەیەکم نووسیوە.

## شێوەی دروست کردنی دەمی نێستای تەواو:

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە پێویستمان بە بەشی سێهەمی فرمان یانی ناوی کارلێکراو هەیە. لە باسی فرمانەکان دا بە وردی باسی جۆرەکانی فرمان کراوە کە ناوی کارلێکراو چۆن دروست دەبێ. ناوی‌کارلێکراو بۆ دروست کردنی نێستای تەواو و رابردووی دوورو هەروەها فرمانە نادیارەکان بەکار دەهێنرێ‌و دوایین ئاڵوگۆڕە کە بەسەر فرمان دێت گرینگییەکی تایبەتی لە زمانی ئینگلیزیدا هەیەو دەبێ لەبەچاو بگیرێ.

بۆ دروست کردنی ئەو دەمە پێویستە لەناوی‌کارلێکراو لەگەڵ فرمانی یاریدەدەری have کەڵك وەربگرین. دیارە فرمانی have بۆ کەسی سێهەمی تاك بە has سەرف دەکرێ‌و بۆ هەموو کەسەکانی دیکە هەر (have)ە.

I have gone there every day for three months.

ماوەی سێ‌مانگ هەموو رۆژێ بۆ ئەوێ چوومە. (چووم)

She has lived there since 1999. ئەو لە ساڵی ١٩٩٩وە لەوێ ژیان دەکات.

**شێوەی پرسیاری و فۆرمی نەرێ:**

بۆ پرسیار کردن پێویستە فرمانی یاریدەدەری to have بێنینە پێش بکەردوە و بۆ فۆرمی نەرێ تەنیا not بەدوای ئەو فرمانەدا دێت. وەکوو:

Have you seen him today? ئایا ئەمرۆ دیتوتە. (دیوتە)؟

I haven't spoken to him for three months.

بۆ ماوەی سێ‌مانگە قسەم لە گەڵدا نەکردووە.

She hasn't seen me since last week.

لە حەوتووی رابردووەوە منی نەبینیوە. (نەدیتوە)

**چەند خاڵێکی گرینگ:**

بۆ بەکارهێنانی ئەم دەمە چەند پێناسەیەك کەڵکیان لێوەردەگیرێ کە بریتین لە:

**For**: ئەم وشەیە لەپێش ماوەی کاتەکەوە بەکار دەهێنرێ. وەك:

I haven't eaten rice <u>for</u> ten days. من بۆماوەی ١٠رۆژە برنجم نەخواردوە.

**Since**: ئەم وشەیە بەمانای (لە)ی زمانی کوردی بەکار دەهێنرێو لەپێش دەست پێ‌کردنی کارەکە کەڵکی لێوەردەگیرێ.

He hasn't rice <u>since</u> <u>ten days ago</u>. ئەو لە ١٠رۆژی پێشەوە برنجی نەخواردوە.

I haven't spoken to him <u>since</u> <u>Morch</u>.

من لە مانگی مارسەوە قسەم لەگەڵدا نەکردووە.

هەروەك دەبینرێ لەم شێوازەدا دەتوانین (کاتو یان ماوەی کات لەگەڵ ago)دا بەکار بێنین.

**Just**: ئەم وشەیە لە کوردیدا بە مانای (چەند ساتێك پێش ئێستا) و لە دەمی ئێستای تەواودا لە دوای فرمانە یاریدەدەرەکانی haveو has بەکار دەهێنرێ. وەك:

I have just finished my work.

من چەند ساتێك پێش ئێستا کارەکەم تەواو کردووە.

**Yet**: ئەم وشەیە مانای (هێشتا، تائێستا) لە زمانی کوردیدا دەداتو لە کۆتایی رستەی پرسیاریو فۆرمی نەرێی ئەم دەمەوە بەکار دەهێنرێ. وەکوو:

Hasn't he finished his work yet? ئایا تا ئێستا کارەکەی تەواو نەکردوە؟

I haven't eaten my lunch yet. من هێشتا نەهارەکەم نەخواردوە.

**ever and never**: ئەم دوو وشەیە هەر ئەو مانایانەی yetیان هەیە. بەڵام شێوەی بەکارهێنانیان لە رستەدا جیاوازە.

**Ever**: لە ڕستە پرسیاریەکاندا بەکار دەهێنرێ‌و never لە ڕستەی نەرێدا. دیارە هەرکات never لە ڕستەکەدا بێت پێویست بە not ناکات چونکە بۆ خۆی ڕستەکە نەرێدەکا. ئایا تا ئێستا قسەت لەگەڵدا کردووە؟ Have you ever spoken to him?

I have never spoken to him? من هێشتا قسەم لەگەڵدا نەکردوە.

هەروەك دەبینرێ جێگای everو never لەدوای بکەرو فرمانی have ە.

**Already**: ئەو وشەیە لە کوردیدا بەمانای (لەپێش)دایەو لەدوای فرمانی hasوhave لە ڕستەکانی دەمی ئێستای تەواودا بەکار دەهێنرێ دیارە دەتوانین لە وشەی before لە کۆتایی ئەو جۆرە ڕستانەدا لەجێگای already کەڵك وەرگرین.

I have <u>already</u> shut the window = I have shut the window <u>before.</u>

من پێشتر پەنجەرەکەم داخستوە.

He has already written a letter = He has written a letter before.

ئەو لە پێش دا نامەیەکی نووسیوە.

**<u>so far = up to now</u>**: ئەم وشانە لە کۆتایی ڕستەی ئێستای تەواو بەکار دەهێنرێن. وەك:

I haven't been very successful so far.

من تا ئێستا زۆر سەرکەوتوو نەبووم.

**<u>Recently = lately</u>**: ئەم دوو وشەیە بەمانای (لەم دوایانەدا، لەم دواییەدا) لە ڕستەکان دا بەکار دەهێنرێن. وەك:

Have you seen her lately? ئایا تۆ لەم دواییانەدا دیتوتە؟ (بینیوتە)

Have you used it recently?

ئایا لەم دواییانەدا بەکارت هێناوە؟(کەڵکت لێ‌وەرگرتوە)

**<u>سەرنج:</u>**

هەروەك لەپێش دا باسمان کرد for لەگەڵ ئەو دەمەدا لەپێش ماوەی کات بەکار دەهێنرێ بەڵام هەرکات لەگەڵ ماوەی کات دا بەکار نەهێنرێ دەتوانی مانای because کە بە کوردی (چونکە، لەبەرئەوەی) بدات و لە دەمەکانی دیکەیش دا بەکار دەهێنرێ.

I believed her for surly she would not lie to me.

من باوەڕ (سیقەم) پێی هەیە چونکە بە دڵنیاییەوە ئەو درۆم لەگەڵ ناکا. (پێ نالێ)

دیارە زۆر جاریش بە مانای (بۆ) بەکار دەهێنرێ وەك:

It's a book for learners of English.

ئەوە کتێبێکە بۆ فێرخوازانی زمانی ئینگلیزی.

## دەمی ئێستای تەواوی بەردەوام

## :The Present Perfect Continuous Tense

ئەم دەمە بۆ بەیانکردنی کار یان حاڵەتی بکەر کە لە رابردوو دەستی پێکردووەو تا ئێستا بێپسانەوە درێژەی بووە بەکار دەهێنرێ. وەك:

She has been sitting here for three hours.

ئەو بۆ ماوەی سێ سەعاتە لێرە دانیشتووە.

ئەو نموونەی سەرەوە نیشانی دەدات کە دۆخی بکەر لە سێ سەعات پێشەوە دەستی پێکردووەو تا ئێستا درێژەی کێشاوە (دیارە بێپسانەوە) یان:

I have been working since morning.

من لە بەیانیەوە خەریکی کار کردنم.

لێرەش دا نیشاندەری ئەوەیە کە بکەر لە بەیانیەوە درێژەی بە کارێك داوەو رەنگە ئەو کاتەی قسەکە دەکات پاش نیوەڕۆ، ئێواری یان هەرکاتێکی دیکە لەرۆژدا بێ. بەڵام ئەو بێپسانەوە لە بەیانیەوە تا کاتی قسە کردنەکە درێژەی بە کارەکە داوە.

### جیاوازی ئەم فرمانە لەگەڵ دەمی ئێستای تەواو :

لێرەدا پێویستە باسی جیاوازیو بەکارهێنانی دەمەکانی (دەمی ئێستای تەواو لەگەڵ دەمی ئێستای تەواوی بەردەوام) بکەین.

هەروەك باسمان کرد ئێستای تەواو بۆ کارێك بەکار دەهێنرێ کە لە رابردوودوە دەستی پێکردوەو تا ئێستا درێژەی هەیە بەڵام نەك بەو مانایە کە بێپسانەوە ئەو کارە کرابێت.

بۆ وێنە: هەرکات بڵێین من ماوەی ٦ مانگە ئینگلیزی دەخوێنم ئەوە دەگەیەنێ کە من لەماوەی دیاریکراودا خەریکی خوێندنی ئینگلیزی بومو شەوو رۆژ بێپسانەوە ئەو کارەم نەکردووە. بەڵکوو لە درێژایی ئەو شەش مانگەدا بەپێی کات ئەو کارەم کردووە.

لە دەمی ئێستای تەواوی بەردەوام دا کە دەڵێین من ماوەی ٨ سەعاتە کاردەکەم نیشاندەری ئەوەیە کارەکەی من لەو ماوەیەدا بێپسانەوە درێژەی هەبووە.

ئەم دەمە زۆرتر بۆ ئەو فرمانانە بەکار دەهێنرێ کە دۆخی بکەری نیشان دەدەن. وەك:

*to sit دانیشتن - to stay مانەوە - to wait چاوەڕێکردن - to lie راکشان*

**شێوەی دروست کردنی دەمی ئێستای تەواوی بەردەوام:**

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە فرمانی مەبەست دێنین ing پێوە زیاد دەکەین وەك هەموو دەمە بەردەوامەکان.

پاشان فرمانی to be کە سەرفکراوەکەی بۆ ئەم دەمە been ە بۆ هەموو کەسەکان وەك یەك سەرف دەکرێ‌و هەروەها فرمانی یاریدەدەری have کە بۆ کەسی سێهەمی تاك (has )ە بەکار دەهێنین. وەك:

We have been waiting for بۆماوەی چەند سەعاتێکە چاوەڕێ دەکەین.

hoursIt has been raining since the day before yesterday.

لە پێرێکەوە باران دەبارێ.

**شێوەی پرسیار کردن‌و فۆرمی نەرێ:**

بۆ پرسیاری‌و نەرێ لەم دەمەدا هەروەك ئێستای تەواو have, has دەبەینە پێش بکەرەوەو notی بۆ دادەنێین.

Have you been waiting for him since two hour ago?

ئایا تۆ لە دوو سەعات لەوە پێشەوە چاوەڕێی دەکەی؟

She hasn’t been playing tennis since I know her.

لەو کاتەوە من دەیناسم ئەو یاری تێنسی (تۆپی سەر مێز)ی نەکردووە.

**سەرنج:**

هێندێك فرمان هەن کە ناتوانین بۆ دروست کردنی ئەم دەمە بەکاریان بێنین هەرچەند ماوەی ئەنجامدانی کارەکەیش تێیدا بەردەوام‌و بێ‌پسانەوە بێ. وەك:

I have known him for three years. بۆ ماوەی سێ ساڵە دەیناسم.

## دەمی ڕابردووی دوور The Past Perfect Tense:

ئەم دەمە بۆ کارێك بەکاردەهێنرێ کە ئەو کارە لەپێش کارێکی دیکە لە ڕابردوودا رووی دابێت. وەك:

When I came there, he had gone. کاتێك من هاتم بۆ ئەوێ ئەو ڕۆیشتبوو.

لەو رستەیەی سەرەوەدا نیشان دەدات کە لە بەشی یەکەم دا ڕابردووی سادە بەکار هێنراوەو لە بەشی دووەم دا ڕابردووی دوور چونکە پێش هاتنی قسەکەر ئەو ڕۆیشتووە.

**شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:**

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە پێویستمان بە ناوی کارلێکراوی فرمانی مەبەستەو پاشان فرمانی to have کە دەبی بۆ دروست کردنی ئەم دەمە ئەویش بکەین بە رابردوو، رابردووی to haveکە پێشتر باسمان کردووە (had)ە و بۆ هەموو کەسەکان وەك یەك سەرف دەکرێ. وەك:

John had already cleaned the house and cooked meal when I got home.

کاتێك گەیشتمە ماڵێ جۆن ماڵەکەی خاوێن کردبووەوەو چێشتی لێنابوو.

After he had finished his work, he went home.

دوای ئەوەی کارەکەی تەواو کرد چوو بۆ ماڵێ.

She hadn't understood the problem until I explain it.

ئەو لە کێشەکە نەگەیشت هەتا بۆم باس کرد. (یانی پێش ئەوەی بۆی باس بکەم نەیدەزانی چییە)

As soon as he had gone out, I slept. هەر ئەو چووە دەرێ من خەوتم.

Had the play already started when you arrived?

ئایا کاتێك تۆ گەیشتی یاریەکە دەستی پێکردبوو؟

هەروەك دەبینرێ بۆ پرسیارو فۆرمی نەرێ لە had لەپێش بکەرو hadn't کەڵك وەردەگیرێ هەروەها ئەم وشانە (after, until, as soon as)لەم دەمەدا بەو شێوانەی سەرووەوە بەکار دەهێنرێن.

هەروەها لە وشەی already بەمانای پێش تر کەڵك وەردەگیرێو دەتوانین وەك ئەو نموونانەی خوارەوە before لە جێگای دادەنێین.

We had already eaten lunch when you called.

پێش ئەوەی تۆ تەلەفون بکەی ئێمە نەهارمان خواردبوو.

when you called we, had eaten lunch before.



## :The Past Perfect Continuous — دەمی ڕابردووی دووری بەردەوام

ئەم دەمە بۆ کارێك بەکار دەهێنرێ کە لە ڕابردووی دووردا لەپێش کارێکی دەمی ڕابردووی سادە بەشێوەی بەردەوام بەڕێوە چووە.

When you arrived, I had been reading book for two hours.

کاتێك تۆ گەیشتی من بۆ ماوەی دوو سەعات بوو خەریکی خوێندنەوە بووم.

بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی ئەو دەمە بڕوانە ئەو وێنەی خوارەوە:




You came at three o'clock, when you came, I had been reading for two hours.

(تۆ لە سەعاتی سێدا هاتی) (کاتێ تۆ هاتی من بۆ ماوەی دوو سەعات بوو خەریکی خوێندنەوە بووم)

### شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە وەك هەموو دەمە بەردەوامەکان پێویستە فرمانی مەبەست بێنین‌و ing پێوە زیاد بکەین پاشان هەروەك ڕابردووی دوور کارلێکراوی have کە (had)ە دەیهێنین‌و دەبێ ناوی کارلێکراوی to be کە (been)ە بە دوایدا بێنین بۆ پرسیار کردن had دەبەینە پێش بکەرەوەو بۆ نەرێ کردن not لەدوای had بەکار دێنین.

*نموونەکان:*

When you came to see me, I had not been working for an hour.

کاتێ هاتی بۆ دیتنم ماوەی سەعاتێك نەبوو کارم دەکرد.

Had Hawar been leaning English in Kurdistan before he went to Europe?

ئایا هاوار پێش ئەوەی بچێ بۆ ئوروپا لە کوردستان خەریکی فێربوونی ئینگلیزی دەبوو؟



## :The Future Tense دەمی داهاتوو

لە درێژەدان بە دەمەکان دەگەینە ئەم دەمە کە خۆی بە چەند جۆر دابەش دەکرێ، .نگی‌یەکی تایبەتی هەیەو هێندێك جاریش گرفت بۆ فێرخوازان ساز دەکات. دیارە شێوەی .ەکارهێنانی ئەم دەمە ئالوگۆری زۆری بەسەردا هاتووەو ئێمە لێرەدا تەنیا باسی ئەو شێوازە .ەدەین کە ئەمڕۆ زۆرینەی ئینگلیزی زمانەکان کەڵکی لێوەردەگرن.

### داهاتووی سادە (ڕووت):

ئەم دەمە بۆ کارێك بەکاردەهێنرێ کە هێشتا ئەنجام نەدراوەو لە داهاتوویەکی دوور یان نزیك دا ئەنجام دەدرێ. بۆ ئەم دەمە کات لە ڕستەدا دیاریکراو نیەو تەکیدی لەسەر ناکرێ.

وەك:
I think I will go there next week.

:لەو باوەڕەدام حەوتووی داهاتوو بڕۆم بۆ ئەوێ.

هەروەك دەبینرێ لەو ڕستەی سەرەوەدا کات دیاری کراوە بەڵام قسەکەر تەکید نیە کە .ارەکە ئەنجام دەدرێ یانی دڵنیا نیە کە دەچی یان ناچێ (یانی چەندە بەرێوەچوونی کارەکە ئیمکانی .ەمە هەر بەو ئەندازەیە پێدەچێ بەرێوە نەچێ).

### شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە فرمانی یاریدەدەری will لەگەڵ چاوگی بێ to فرمانی .ەبەستمان دوای بکەر بەکار دێنین. فرمانی will لە ڕستەکان دا کورت دەکرێتەوەو دەبێتە ('ll).

He'll come to see me next week. حەوتووی داهاتوو ئەو دێ بۆ دیتنم.

### شێوەی پرسیاری کردنی ئەم دەمە:

بۆ پرسیاری‌کردنی دەمی داهاتووی سادە پێویستە فرمانی یاریدەدەری will بهێنرێتە .ێش بکەرەوە. وەك:

Will you be here next week? ئایا تۆ حەوتووی داهاتوو لێرە دەبی؟

### فۆرمی نەرێ:

بۆ فۆرمی نەرێ لەم دەمەدا پێویستە ئالوگۆرێکی بچووك بەسەر فرمانی یاریدەدەری willدا بێنین بۆ فۆرمە نەرێکان will دەبێتە won't . وەك:

I won't ready dinner until 8:00.

تا سەعات هەشت شام (شێو) حازر ناکەم.

## خاڵێکی گرینگ:

هەرکات دوو ڕستەی هاوکات لەدەمی داهاتوودا بەکار بهێنرێن کە باس لە شتێك بکەنو وشەکانی پێوەندی کات وەك (until, before, after, as soon as, when) بەکار بهێنرێنو هەروەها وشەی (if) کە لەگەڵ ڕستە مەرجی‌یەکان بەکار دەهێنرێ، کەڵکی لێوەرگیرابێ ڕستەی دوای ئەم وشانە نابێ will یان لەگەڵدا بەکار بێنینو دەبێ لە دەمی ئێستای سادە کەڵك وەرگرین بێئەوەی دەمی ڕستەکە لە ناوەرۆك دا بگۆڕێ. وەك:

When our guests arrive, we'll eat.

کاتێك میوانەکانمان بگەن ئێمە نان دەخۆین.

As soon as I have some news, I'll phone you.

هەر کە بڕێك هەواڵم دەست کەوت تەلەفۆنت بۆ دەکەم.

I'll do my work after I have a bath. دوای ئەوەی خۆم بشۆم کاردکەم دەکەم.

I'll speak to you before I leave. پێش ئەوەی بڕۆم قسەت لەگەڵ دا دەکەم.

We will stay here until the rain stop.

ئێمە لێرە دەمێنینەوە تا باران رادەوەستێ.

*لە باسی فرمانەکان دا بە وردی باسی جیاوازی نێوان will, shallمان کرد و وتمان هێندێك جار بۆ کەسی یەکەمی تاكو کۆ لە shall کەڵك وەردەگیرێ. هێندێك خاڵی بەکارهێنانی باس کراو ئێستاش جیاوازیەکی دیکەی نێوان ئەم دوو فرمانە باس دەکەین

*Shall* هەرکات لەگەڵ کەسەکانی یەکەمی تاكو کۆ بەکار بهێنرێ دەریدەخا کە ئنجامدانی کارێك لە دەستی بکەردا نیەو بکەر ناتوانێ ڕێگر بێ لە بەرێوە چوون یا نەچوونی کارەکە. وەك:

I shall be twenty five next month.

من مانگی داهاتوو دەبمە بیستو پێنج ساڵە.

**دوو نموونەی دیکە:**

I will see him tomorrow. من سبەینێ دەیبینم.

I shall see him tomorrow.

هەردووی ئەو ڕستانەی سەروە مانای ئەوە دەدەن کە بکەر سبەینێ ئەو دەبینێ بەلاَم جیاوازیەك لەنێوان ئەو دوو ڕستەیەدا هەیە لەوەی سەرەو بکەر بڕیاری داوە کە سبەینێ بچێ بۆ دیتنی بەلاَم لە ڕستەی ژێرەوەدا ئەوە دەردەخا کە سبەینێ دەیبینی بێئەوەی خۆی بڕیاری دابێ یان بەهۆی کاردکەیەوەو یان هەر هۆیەکی دیکەوە بێ.

**سەرنــج:**

لە زمانی کوردیدا بۆ باس کردن لە داهاتوور رانـەبردوو (ئێستا) بەیـەك شـێوە قسـە دەکرێ. بۆ وێنە:

١-کاتێك میوانەکانمان بێن ئێمە نان دەخۆین. (داهاتوو)

٢-میوانەکانمان بێن نان دەخۆین. (ئێستا)

هەروەك دەبینرێ شێوەی بەکارهێنانی فرمان لەهەردوو رستەدا بەیەك جۆرە، دیـارە لـە ئینگلیزیدا بەهۆی فرمانە یاریدەدەرکانەوە ئەو گرفتە نیەو لە هێنـدێك زمـانی دیکـەیش بـۆ نمونە فارسی وشەیەك هەیە (خـواهم) کـە نیشـاندەری داهـاتووەو گـوێگر بـە جـوانی تێـدەگا ئەگەر باسی کام دەم دەکات بەلاّم لە کوردیدا ئەو گرفتە هەیەو گوێگر تەنیا بە جۆری بەیان کردنی رستە لەلایەن قسەکەرەوەو یان رستەکانی پێش‌و دوای ئەو رستەیە تێدەگات باس لـە چ دەمێك دەکرێ.

## دەمی داهاتووی بەردەوام :The Future Continuous Tense

ئەم دەمە بۆ کارێك بەکار دەهێنرێ کە لە داهاتوودا ئـەنجام بـدرێ بـە مـەرجێ بڕیـاری پەیوەچوونی کار لە مێشکی بکەردا درابێ‌و بێگومان لە داهاتوودا ئەنجام بدرێ. وەك:

He will be written a letter. ئەو نامەیەك دەنووسی (ئەو نیازی ئەوەی هەیە نامەیەك بنووسێ)

### شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە پێویستە چاوگی بـێ toی فرمـانی مەبەسـت وەرگـرین ing زیاد کەین چاوگی بێ toی فرمـانی to beکـە دەبێتـە beو لـەپێش ئـەویش دا فرمـانی یاریدەدەری will بەکار بهێنین.

### چەند خاڵێك بۆ بەکارهێنانی ئەم دەمە:

دەمی داهاتووی بەردەوام زۆرجار لەگەڵ ئەم سێ‌خاڵەدا بەکار دەهێنرێ:

*١-ئاوەڵفرمانی at this time پێش ئاوەڵفرمـانی دەمـی داهـاتوو وەك next – tomorrow*. وەك:

At this time next year you will be studying in university.

ساڵی داهاتوو ئەم کاتە تۆ لە زانکۆ خەریکی خوێندن دەبی.

*٢-بەکارهێنانی all لەپێش ئاوەڵفرمانەکانی دەمی داهاتوودا: وەك:*

We will be working in the factory all the day tomorrow.

سبەینێ هەمووی ڕۆژ (لە بەیانیەوە تا ئێوارە) لە کۆمپانیا کار دەکەین.

*٣-وشەی مەرجی If کە لەگەڵ ناوەڵفرمانی داهاتووی دیاردا بێت. وەك:*
If you come at 9:00, we will be having dinner.
ئەگەر لە سەعاتی نۆدا بێی ئێمە خەریکی نان (شیو) خواردن دەبین

**جیاوازی ئەم دەمە لەگەڵ دەمی ئێستای بەردەوام:**

وتمان ئێستای بەردەوام بۆ داهاتوویش بەکار دەهێنرێ بە مەرجێ لە داهاتوویەکی نزیك دا کارەکە ئەنجام بدرێ. دیارە لەو حاڵەتەدا دانانی ناوەڵفرمانی کات پێویستەو دەبێ دابنرێ. لە حاڵێك دا لە داهاتووی بەردەوام دا کات چ دابنرێو چ دانەنرێ هیچ گرفتێك دروست ناکا. هەروەها ئەنجامی کارەکە وەك لە دەمی ئێستای بەردەوام دا دەبێ نزیك بێ لە داهاتووی بەردەوام دا بەو خێرایە نیە. وەك:

He is writing letter tomorrow. — ئەو بەیانی نامەیەك دەنووسێ.
He will be writing a letter. — ئەو نامەیەك دەنووسێ.

**شێوەی پرسیاریو فۆرمی نەرێ:**

بۆ ئەم مەبەستە هەر لە فرمانی یاریدەدەری will کەڵك وەردەگیرێو بۆ فۆرمی نەرێ won't بەکار دەهێنرێ. کورت کراوەی will لە رستەکان دا دوای بکەر ('ll)ە .

## دەمی داهاتووی تەواو The Future Perfect Tense:

ئەم دەمە بۆ بەیانکردنی کارێك بەکار دەهێنرێ کە لە کاتێکی دیاریکراودا تەواو بکرێت دیارە ئەو کاتە دیاریکراوە دەبێ لە داهاتوودا بێت. یان هەرکات بمانەوێ بەڵێنی تەواوکردنی کارێك لە کاتێکی دیاریکراو لە داهاتوودا بدەین لە دەمی داهاتووی تەواو کەڵك وەردەگرین.

**شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:**

بۆ دروست کردنی دەمی داهاتووی تەواو پێویستە ناوی کارلێکراوی فرمانی مەبەستمان بێنینو هەروەها فرمانی یاریدەدەری have کە لەم دەمەدا بۆ هەموو کەسەکان وەك یەك سەرف دەکرێنو فرمانی یاریدەدەری دەمی داهاتوو یانی will بەکار بێنین.

وەکوو:
I will have finished my work by next week.
من حەوتووی داهاتوو کارەکەم تەواو دەکەم. یان دەتوانین بەم شێوەیە بیڵێین.
من تا حەوتووی داهاتوو کارەکەم تەواو کردووە.
He will have written a letter by next Sunday.
ئەو تا یەکشەمەی داهاتوو نامەیەك دەنووسێ.

## دەمی داهاتووی تەواوی بەردەوام

: The Future Prefect Continuous Tense

ئەم دەمەیش هەروەك داهاتووی تەواو بۆ کارێك بەکار دەهێنرێ کە لە کاتێکی دیاریکراو لە داهاتوودا تەواو بکرێ بەڵام لێرەدا مەرجێك هەیە. دەبێ تا کاتی تەواوبوونی کارەکە یا دۆخی بکەر بەردەوامو بێپسانەوە درێژەی هەبێ.

ئەم دەمە زۆر بەکەمی لە زمانی ئینگلیزیدا بەکار دەهێنرێ بەڵام زۆرجار لە بەکارهێنانیدا ئەو خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو دەگیرێ.

١-هاتنی ئاوەڵفرمانی کات لە سەرەتای رستەدا.

٢-زێدەواژەی by لەگەڵ کاتی دیاریکراوی داهاتوو لە رستەدا.

٣-(ماوەی کات + for) لە کۆتایی رستەدا.

***نموونەکان:***

By next year, we will have been living here for 20 years.

تا ساڵی داهاتوو دەبێتە بیست ساڵ کە ئێمە لێرە ژیان دەکەین.

***یان دەتوانین بڵێین:***

ساڵی داهاتوو ئێمە ماوەی بیست ساڵە کە لێرە ژیانمان کردوە.

*دەتوانین رستەکەی سەرەوە بە لابردنی by بنووسین بێئەوەی ماناکەی بگۆڕێ.

Next year, we will have been living here for 20 years

**شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:**

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە فرمانی مەبەستمان بە شێوەی چاوگ بێ to بەکار دێنین ing پێوە زیاد دەکەین لە پێش ئەودا لە ناوی کارلێکراوی to be یانی been کەڵك وەردەگرینو فرمانی یاریدەدەری have لەدوای will دەخەینە پێش ئەودوە. بەو شێوەیە دەمەکە، دروست دەبێ.

By next month she will have been waiting for a years.

تا مانگی داهاتوو ماوەی یەك ساڵە کە چاوەڕوانی کردووە.

## دەمــــی داهاتوو بە going to:

ئەم دەمە یەکێك لەو دەمانەیە کە لە ئینگلیزیدا بەزۆری بەکار دەهێنرێو ئەمرۆ زۆرینەی خەڵکی ئینگلیزی زمان بۆ بەیان کردنی دەمی داهاتوو کەڵکی لێوەردەگرن. فرمانی

going to نەك هەر بەڕێوەچوونی كارەكە لە داهاتوودا بەیان دەكا بەڵكوو ویستو دڵنیاییو خواستی بكەر بەرامبەر بە ئەنجام كارەكە دەدەخا. وەك:

He is going to write to me. ئەو نیازی وایە (دەیهەوێ) نامەم بۆ بنووسی.

We are going to work tomorrow. نیازمان وایە سبەینێ كار بكەین.

**شێوەی دروست كردنی ئەم دەمە:**

بۆ دروست كردنی ئەم دەمە لەپێش going to سەرفكراوی to be لە دەمی ئێستایدا كە دەبێتە (are,is,am) بەپێی كەسەكان بەكار دێنن بەدوای ئەودا چاوگی فرمانی مەبەست بێ to بەكار دەهێنین. وەك:

They are going to buy a car. نیازیان وایە سەیارەیەك بكڕن.

**شێوەی پرسیاری:**

بۆ پرسیاركردنی ئەم دەمە فرمانی یاریدەدەری to be دەبەنە پێش بكەرەوە. وەك:

Is she going to learn English? ئایا ئەو نیازی وایە ئینگلیزی فێر بێت؟

**شێوەی پرسیاری:**

بۆ نەرێ كردنی ئەم دەمە تەنیا not لەدوای فرمانی to be دادەنێین. وەك:

I am not going to make dinner. نیازم وایە شیو دروست نەكەم.

***سەرنــج:***

لەو رستانەدا كە وشەی (until, if, till, when, as soon as, unless) تێدا بەكار هێنراوە ناكرێ لە going to كەڵك وەربگرین.

وەكوو:

If you go with him, he will give you a book.

ئەگەر لە گەڵیدا بڕۆی كتێبێكت پێدەدات.

*لەو رستەی سەرەوە ناتوانین going to بەكار بێنین چونكە مەرج لە ئارادایەو (بڕیار داخوازی- نیاز- دڵنیایی) لەلایەن بكەرەوە بەیان ناكرێ.

**جیاوازی ئەم دەمە لەگەڵ دەمی داهاتووی سادە:**

هەروەك باسمان كرد ئەو دەمە كاتێك بەكار دەهێنرێ كە (بڕیار- نیاز- داخوازی دڵنیایی) لەلایەن بكەرەوە دەدەخات بەڵام ئەگەر ئەو شتانە لەلایەن بكەرەوە دەرنەخرێ ئەوە لە داهاتووی سادە كەڵك وەردەگرین.

بۆ زیاتر روون بوونەوەی ئەو خاڵە بڕواننە ئەو رستانە:

I am going to make a chicken for dinner. ( I decided this morning and bought every thing for it.)

من نیازم وایە بۆ شام مریشك لێ‌نێم. (هەر لە بەیانیەوە ئەم بڕیاردم داوەو هەموو شتێکم بۆ کڕیوە.)

I'll make chicken. (I decided at the moment of speaking.)

من مریشك دروست دەکەم (لە کاتی قسە کردندا بڕیارم دا)

## جیاوازی دەمی going to لەگەڵ داهاتووی بەردەوام:

دەتوانین بڵێین لەهەموو شێوەی بەکارهێنانی ئەم دوو دەمەدا بێجگە لە شێوەی پرسیاری دەتوانین لە جێگای یەکتر بەکاریان بێنین. وەك:

لەهەردووکی ئەم ڕستانەدا مانای "ئەو نیازی وایە نامەیەك بۆ هاوڕێکەی بنووسێ"

He is going to write a letter to his friend= He will be writing a letter to his friend.

*دیارە لە ڕستەی دووەم دا داهاتووی بەردەوام دڵنیایەکی زۆرتر بە گوێگر دەدات بە دەبەستی بەڕێوەچوونی کارەکە.

## جیاوازی لە شێوازی پرسیار ئەم دەمەدا:

لە پرسیاری going to پرسیارکەر نیازی ئەوەیە کە بزانێ ئایا بڕیاری ئەنجامی کار لە داهاتوودا هەیە بەڵام لە دەمی داهاتووی بەردەوام دا نیازی پرسیارکەر ئەوەیە کە بزانی کارێك لە داهاتوودا ڕوودەدا کە دیار نیە ڕوویداتو یان نا. وەك:

Are you going to write a letter to your friend?

ئایا نیازت هەیە نامەیەك بۆ هاوڕێکەت بنووسی؟

Will you be writing a letter to your friend?

ئایا نامەیەك بۆ هاوڕێکەت دەنووسی؟

## بەکارهێنانی go, come لەم دەمەدا:

لە شێوازی بریتانیایدا بەکارهێنانی go, come لەگەڵ ئەم دەمەدا هەڵەیە بەڵام لە شێوازی ئەمریکاییدا هێندێك جار بەکار دەهێنرێ دیارە باشتر ئەوەیە لەگەڵ ئەم فرمانانەدا ئەم دەمە بەکار نەهێنرێو لە دەمی نێستای بەردەوام کەڵك وەربگیرێ.

I am going to go to school tomorrow.

لە جێگای ئەمە ئەو شێوازە خوارەوە بە کار بێنن.

I am going to school tomorrow. من بەیانی دەچم بۆ قوتابخانە.

### دەمی داهاتووی سادە لە ڕابردوودا

## :The Simple Future Tense in the Past

هەرکات کارێك لە ڕابردوودا ئەنجام بدرێ ئەو کارە بەرامبەر بە کارێکی ڕابردووی دیکە مانای داهاتوو بدات پێی دەڵێن داهاتوو لە ڕابردوو.

ئەم دەمەش دابەش دەبێ بەسەر چەند جۆردا کە یەکێك لەوانە دەمی داهاتووی سادە لە ڕابردوو دایە بۆ ئەوەی زیاتر لەسەر ئەو دەمە بزانین سەرنج دەدەینە ئەو وێنەی خوارەوە.

بەیانی morning نیوەڕۆ noon دوانیوەڕۆ afternoon

8 10 12 2

past future in the past now future

At 8:00 shahla said that she would write the letter at 10:00.

سەعات هەشتی بەیانی شەهلا وتی سەعات دە نامەکە دەنووسم.

*هەروەك دیارە کاتی نووسینی نامەکە هەرچەند ڕابردوو بووە بەڵام ئەو کاتەی قسەکەی تێدا کراوە وەك دەمی داهاتوو باسی لێوە کراوە لە ڕاستیدا کاتی قسەکردنەکە ئەنجام دانی کار لە داهاتوودا بووە (مەبەست لە قسەی بکەرە نەك ئەو کەسەی دووپاتی دەکاتەوە.)

### شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە پێویستمان بە فرمانی یاریدەدەری (would)ە کە بۆ هەموو دەمەکانی داهاتوو لە ڕابردوودا بەکار دەهێنرێ. لەدوای would بۆ ئەم دەمە پێویستە چاوگی بێ toی فرمانی مەبەستمان بەکار بێنین. وەك: She would write.

### بۆ بەکارهێنانی ئەم دەمە ئەو دوو خاڵەی ژێرەوە زۆر بەکار دەهێنرێن.

١-لە گۆڕینی ڕستەکانی داهاتووی دیار (معلوم) بۆ ڕستەی نادیار (مجهول): وەك:

He said "I ***will come*** there' = He said that he ***would come*** here.

ئەو وتی دێم بۆ ئەوێ .

٢-لە ڕستە مەرجیەکانی (نائیحتیمال)

If I saw him, I would speak to him. ئەگەر بمدیایە قسەم لەگەڵدا دەکرد.

***

## دەمی داهاتووی بەردەوام لە ڕابردوودا
## *The Future Continuous Tense in the Past*

ئەم دەمە کارێك دەکات کە لە دەمی داهاتوو لە ڕابردوودا بە بەردەوامی درێژەی بێت.

وەك: He said that he would be reading a book at 8:00 that day.

ئەو وتی کە سەعاتی هەشتی ئەو ڕۆژەوە خەریکی خوێندنەوەی کتێبێك دەبێت.

They said they would be working the following week.

ئەوان وتیان حەوتووی داهاتوو خەریکی کارکردن دەبن

**شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:**

بۆ دروست کردنی ئەم دەمە پێویستە لەو یاسایەی ژێرەوە کەڵك وەرگرین.

بکەر +would + be + فرمانی ئەسڵی + ing

وەکوو: They would be working.

## دەمی داهاتووی تەواو لە ڕابردوودا
## The Future Perfect Tense in the Past

ئەم دەمە بۆ بەیان کردنی کارێك بەکاردەهێنرێ کە لە داهاتوو لە ڕابردوودا تەواو ئەبێ.

He said that he would have finished the book by the next month.

ئەو وتی کە تا مانگی داهاتوو کتێبەکەی تەواو کردووە. (تەواوی دەکات)

*هەروەك دەبینرێ کاری تەواوکردنی کتێبێك لە کاتێکی دیاری کراودا تەواو دەبێ. ئەم دەمە بۆ دروست کردنی ڕستەی مەرجی مەحاڵ یان ڕابردووی مەحاڵ کەڵکی لێوەردەگیرێ.

وەك: If I had seen him last week, I would have spoken with him.

ئەگەر حەوتووی پێش بمدیایە، قسەم لەگەڵ دەکرد.

**شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:**

بۆ دروست کردنی دەمی داهاتوو یتەواو لە ڕابردوودا لەو فۆرمانەی ژێرەوە کەڵك وەردەگرین.

ناوی کارلێکراو + would + have + بکەر ( I would have spoken )

### دەمی داهاتووی تەواوی بەردەوام لە رابردوودا

## The Future Perfect Continuous in the Past

ئەم دەمە بۆ بەیانکردنی کارێك بەكار دەهێنرێ کە لە رابردوودا دەستی پێکردوە بەشێوەی بەردەوام تا دەمی داهاتوو لە رابردوودا درێژەی هەیە. وەك:

They said that the next month they would have been living in Iran for ten years.

ئەوان وتیان مانگی داهاتوو دەکاتە دە ساڵ کە لە ئێران ژیان دەکەن.

They said that following week they would have been learning English for six months.

وتیان کە حەوتووی داهاتوو دەبێتە شەش مانگ کە خەریکی فێربوونی زمانی ئینگلیزین.

### شێوەی دروست کردنی ئەم دەمە:

بۆ دروست کردنی دەمی داهاتووی تەواوی بەردەوام لە رابردوودا لەو یاسایەی ژێرەوە کەڵك وەردەگرین.

بکەر +would +have +been + فرمانی ئەسڵی +ing

وەك: He would have been living.

**سەرنج:**

پێویستە بوترێ کە دەمەکانی داهاتوو لە رابردوودا لەکاتی بەکارهێنانی قسە گێرانەوەی ناراستەوخۆ بەکار دەهێنرێن کە لەپێشەوە فرمانی to say کە دەمی رابردووەکەی (said)ە بەکار دەهێنرێ.

## جێناوی لکاو یان پێوەندی : *Relative Pronouns*

جێناوی پێوەندی بەو جێناوانە دەڵێن کە دوو رستە پێکەوە پێوەند دەدەن گرینگترین ئەم جێناوانە بریتین لە:

what, that, whose, which, whom, who بەو شێوەیەی ژێرەوە بەکاریان دێنین.

**١-جێناوی پێوەندی who:**

ئەم وشەیە لە نێودراستی رستە بەکار دەهێنرێ و ئەو پێناسانەی ژێرەوەی هەیە.

a-بەرانبەرە لەگەڵ (کە) لە زمانی کوردیدا.

b-ئاماژە بە مرۆڤ دەکات و حاڵەتی بکەری هەیە.

C-بەدوای ئەودا فرمان بەکار دەهێنرێ. وەك:

The girl <u>who</u> gave me this book is my friend.

ئەو کچەی ئەم کتێبەی پێدام هاوڕێمە.

**خاڵێکی گرینگ:**

ئەگەر جێناوی پێوەندی who لە ڕستەی دەمی ئێستای سادەی بەردەوامو ڕابردووی سادەی بەردەوام بەکار بهێنرێ دەتوانین وشەی whoو فرمانی to be تایبەت بە ڕستەکە لابەرینو فرمانو ing بەدوای کەسەکەدا بەکار بێنین. وەك:

The girl who is reading the newspaper, is my daughter.

ئەو کچەی خەریکی ڕۆژنامە خوێندنەوەیە کچی منە.

**٢-ڕاناوی پێوەندی whom:**

ئەم وشەیە لە نێوەڕاستی ڕستەدا بەکار دەهێنرێ ئەو پێناسانەی ژێرەوەی هەیە.

a-مانای (کە ئەو- کە بۆ ئەو – کە ئەوانت – کە بۆ ئەوان) دەدات.

b-ئاماژە بە مرۆڤ دەکات، سەرچاوەکەی مرۆڤە.

c-بەدوای ئەودا لە بکەر کەڵك وەردەگرین (حاڵەتی کارلێکراوی هەیە) نموونە:

The man whom I gave him the book, is teacher.

ئەو پیاوەی من کتێبەکەم پێدا، مامۆستایە.

The pupils whom I punished them, were too lazy.

**دوو خاڵی گرینگ:**

*١)هێندێك لە فرمانەکان زێدەواژەی تایبەتیان لەگەڵدایە ئەگەر لە ڕستەیەك دا کە جێناوی پێوەندی whomی تێدایە ئەو فرمانانە بەکار بێن دەتوانین بەدوو شێوە بیان نووسین.*

The girl <u>whom</u> you spoke <u>with</u> was very beautiful.

The girl <u>with</u> <u>whom</u> you spoke was very beautiful.

ئەو کچەی تۆ قسەت لەگەڵدا کرد زۆر جوان بوو.

*٢)دەتوانین whomلە ڕستەکە هەڵگرین بێئەوەی گرفتێك دروست بکات.*

The baby whom you kissed him, is her child.

The baby you kissed him is her child.

ئەو منداڵەی ماچت کرد منداڵی ئەوە.

## جێناوی پێوەندی which:

ئەم وشەیە لە نێوەڕاستی ڕستەدا بەکار دەهێنرێ ئەو تایبەتمەندیانەی خوارەوەی هەیە.

a-بەمانای (کە) لە زمانی کوردی دایە.

b-ئاماژە بە شت دەکات یانی سەرچاوەکەی بێ گیانە.

c-حاڵەتی بکەرو کارلێکراوی هەیە(بۆ هەردووکیان کەلکی لێوەردەگیرێ)

The car which cames here, is very fast.

ئوتومبیلەکەی دێ بۆ ئێرە زۆر خێرایە. (لە دۆخی بکەردا)

The car which he drives, is very fast.

ئەو ئوتومبیلەی ئەو لێی‌دەخوڕێ زۆر خێرایە. (لە دۆخی کارلێکراودا)

*دەتوانین which لە دۆخی کارلێکراودا وەك: whom لە ڕستەدا لای‌بەرین. وەك:

The car he drives, is very fast.

ئەو ئوتومبیلەی ئەو لێی‌دەخوڕێ زۆر خێرایە

*هەرکات لە ڕستەیەك دا کە which بەکار دێنین فرمانەکە زێدەواژەی لەگەڵدا بێت هەروەك whom دەتوانین لە پێشیەوە بینوسین یان بیخەینە دوای فرمانەوە.

وەکوو:

The book which you picked up, is very expensive.

The book up which you picked, is very expensive.

ئەو کتێبەی تۆ هەڵت گرت زۆر گرانە.

## ٤)جێناوی پێوندی whose:

ئەم وشەیە لە نێوەڕاستی ڕستەدا بەکار دەهێنرێو ئەو تایبەتمەندیانەی ژێرەوەی هەیە.

a-بەرانبەر لەگەڵ (کە... ی — کە... یان) لە زمانی کوردی‌دا.

b-هەم بۆ مرۆڤو هەم بۆ شت (بێ گیان) بەکار دەهێنرێ.

c-بەدوایدا دەبێ ناو بەکار بێنین چونکە جێگری ئاوەڵناوی خاوەنداریەتی‌یە.

The girl whose name is Gazing, went to school.

ئەو کچەی کە ناوی گزینگە چوو بۆ قوتابخانە.

The book whose colour is blue, belongs to my teacher.

ئەو کتێبە کە ڕەنگەکەی شینە هی مامۆستا کەمە.

**٥)جێناوی پێوەندی that:**

ئەم وشەیە لە نێوەراستی ڕستەدا بەکار دەهێنرێ و بەرانبەر لەگەڵ which و دەتوانین لەجێگای (who و whom)یش بەکاری بێنین. ئەو وشەیە لەو خاڵانەی ژێرەوەدا بەکاردەهێنرێت.

a-هەرکات ڕستەکە ئاوەڵناوی پلە بەرزی تێدا بێت باشترە لە جێگای which لە that کەڵك وەربگرین. وەك:

This is the best book that I have ever read.

ئەمە باشترین کتێبە کە تا ئێستا خوێندومەتەوە.

b-هەرکات ئەو وشانە ( one, something, anything) لە ڕستەدا بن کەڵکی لێوەردەگیرێ. وەك:

I don't have anything that I eat. شتێکم نیە تا بیخۆم.

I speak to a teacher the one that is very kind.

من قسەم لەگەڵ مامۆستایەك دا کرد ئەوەی کە زۆر دڵسۆزە.

c-هەرکات ژمارە ڕیزکراوەکان لە ڕستەدا بن. وەك:

This is the first time that I see her. ئەمە یەکەمین جارە کە دەیبینم.

**٦)جێناوی پێوەندی what:**

ئەم وشەیە هێما بە هیچ سەرچاوەیەك ناکات و دیار نیە ئەو کەسەی یان شتەی ئاماژەی پێدەکات چیە مەگەر بە دوایدا ئاماژەی پێبکرێت. وەك:

I don't know what he bought yesterday. نازانم دوێنێ ئەو چی کڕی.

Do you know what she is eating. ئایا تۆ دەزانی ئەو خەریکە چی دەخوات.

هەروەك لەو ڕستانەی سەرەوەدا دیارە لەپێش whatدا هیچ سەرچاوەیەك نیە.



## ناوەلکرمانەکانی پێوەندی (لکاو) :Relative Adverb

### ١)ئاوەلفرمانی پێوەندی where :

ئاماژە بە شوێن دەکات و لەراستیدا لە جێگای (جێناوی پێوەندی which ، زیدەواژەی in) بەکار دەهێنرێ. وەك:

Sine is the same city ***where*** I have lived.
Sine is the same city ***which*** I have lived ***in***.
Sine is the same city ***in which*** I have lived.

*بۆ هەرسێ ئەو رستانە یەك مانا هەیە (سنە هەر ئەو شارەیە کە ژیانم تێدا کردووە.)

### ٢)ئاوەلفرمانی پێوەندی when:

ئاماژە بە کات دەکات و بەو شێوەی خوارەوە بەکار دەهێنرێت:

The year when he was abroad, I was in my country.

ئەو ساڵەی ئەو لە دەرەوە بوو من لە ولاتەکەم دا بووم.

*- هەرکات ئاماژە بە رۆژەکانی حەوتوو بکات دەتوانین لە جێگای ئەو which لەگەل زێدەواژەی on بەکار بێنین. وەك:*

Sunday is the day <u>***when***</u> I finish my work.

یەکشەمە هەر ئەو رۆژیە کە من کارەکەم تەواو دەکەم.

Sunday is the day <u>***on which***</u> I finish my work.

### ٣)ئاوەلفرمانی پێوەندی why:

هۆکارو سەبەبی ئەنجامی کارێك بەیان دەکات. وەکوو:

I don’t know why he was so much angry. من نازانم بۆ ئەوەندە تورە بوو.

* * *

## جێناوە نادیارەکان Indefinite Pronouns:

لەئینگلیزیدا هێندێك وشە هەیە پێیان دەڵێن جێناوی نادیار کە بریتین لە:

**١) (someone, somebody, something) ئەم وشانە کە پێکهاتەی ( some)ن**

**لە رستەکان دا بەکار دەهێنرێن- تەنیا لەو رستانەدا کە فۆرمی ئەرێن positive وەك:**

We should call a doctor or someone.

ئێمە دەبێت پزیشکێك یان کەسێك بانگ بکەین.

somebody must tell me what it is.

دەبێ کەسێك بە من بڵـێ ئەوە چیە.(داخوازی)

give me something to do.

شتێکم پێبدە تا ئەنجامی بدەم. (مەبەست کارە)

*وشەی some هەموو کات بۆ رستە ئەرێکان بەکار دەهێنرێت کە رادەی (چەندایەتی)

ستەکان دیاری دەکات، دیارە لەگەڵ ئەو ناوانەی کە ژمارە ناکرێن.

وەك: tea, water, milk و هەروەها ئەو ناوانەی ژمارە دەکرێن بەشێوەی کۆ بەکار

دەهێنرێن. وەك:

There is some milk. برێك شیر هەیە.

I have some books. من چەند کتێبێکم هەیە.

**سەرنج:**

لە رستە پرسیاریەکان دا هەرکات قسەکەر، داخوازی بۆ خواردن بکات لە some کەڵك

وەردەگرن. وەك:

Would you like some milk ? ئایا تۆزێك شیر دەخۆیتەوە؟

Do you want something to eat? ئایا شتێکت بۆ خواردن دەوێ؟

Can I have some apples, please? تکایە دەتوانم برێك سێو بخۆم؟

٢) anyone , anybody, anything ئەم وشانە پێکهاتەی (any)ین و هەموو کات

لە رستەی نەرێ negative و رستە پرسیاریەکان question بەکار دەهێنرێن.

Does anyone else want to come? ئایا کەسێکی‌تر دەیهەوێ بێت؟

Anyone didn't see me. کەسێك منی نەدیت. (نەبینی)

She wasn't anybody before she got that job.

ئەو پێش ئەوەی ئەو کارە بەدەست بێنێ کەسێك نەبوو (کەسێکی ناسراو یان دەوڵەمەند) نەبوو.

Did you buy anything yesterday? ئایا دوێنێ شتێکت کڕی؟

I didn't buy anything. من هیچ شتێکم نەکڕی.

*هەروەها وشەی any بۆ ئاماژەکردن بە چەندایەتی (رادەی)، شتێك بەکار دەهێنری کە لەگەڵ ناوە نەژمێراوەکانو ناوە ژمێردراوەکان کە لە شێوەی کۆ بەکار بهێنرێن کەڵکی لێوەردەگیرێ. (لەرستە نەرێو پرسیاریەکان دا) وەك:

We don't have any wine. ئێمە مەشروبمان هیچ نیە.

I don't need any books. من پێویستیم بە هیچ کتێبێك نیە.

Are there any eggs? ئایا هیچ هێلکەی لێیە؟

*هێندێك جار دەتوانین لە anyو پێکهاتەکانی لە رستە ئەرێ (positive)ەکان بەم شێوانەی خوارەوە کەڵك وەرگرین.

لەو رستانەدا کە ئاماژە بە ناوە ژمێردراوەکانی تاك دەکات. وەك:

Take any book you like. هەر کتێبێك پێت باشە بیبە.

وشەی anything لەو رستانەدا کە نیازی توندی بکەر دەردەخەن. وەك:

I'm so hungry, I'll have to eat anything.

ئەوەندەم برسیە کە دەبێ شتێك بخۆم.

**وشەی anyone یان anybody لەم جۆرە رستەی خوارەوە بەکار دەهێنرێ.**

The exercise are so simple that almost anyone can do them.

مەشقەکە ئەوەندە ئاسان بوو کە تا رادەیەك هەموو کەس توانی ئەنجامی بدات

٣) no one و no body و nothing ئەم وشانە پێکهاتەی (no)ن هەرکات لە رستەدا بەکار بهێنرێن مانای نەرێ بە رستە دەبەخشێ بێئەوەی لە فرمانی نەرێ کەڵك وەرگرین. وەك:

No one was at home. هیچ کەس لە ماڵێ نەبوو.

I knew nobody there. هیچ کەسم لەوێ نەدەناسی.

Nothing matters to him apart from his job.

بێجگە لە کارەکەی هیچ شتێك بە لایەوە گرینگ نیە.

**جیاوازی بەکارهێنانی no و none:**

ئـەم دوو وشـەیە یـەك مانایـان هەیـە هـەردووکیان لەرسـتە نەرێکانـدا positive بەکاردەهێنرێن. مانای نەرێ negativeی پێدەبەخشن.

جیاوازیەکەیان ئەوەیە no ناوەڵناوە لەپێش ناودا بەکار دەهێنرێ لـە حاڵێـك دا none جێناوەو لە جێگای noو ناوێك کە بەدوایدا دێت بەکار دەهێنرێ.

وەکوو:

I searched for some books but I found ***none*** there.

من بۆ برێك کتێب گەرام بەڵام هیچیانم نەدۆزیەوە.

I searched for some books but I found ***no book*** there.

**No دەتوانێ جێگای not any بگرێتەوە هەم دەتوانێ لەپێش ناوی ژمێردراوو هەم پێش نەژمێردراو بەکار بهێنرێ. وەك.**

There were ***not any*** letter this morning .

ئەم بەیانیە هیچ نامەیەك نەبووە.

There were ***no*** letter this morning .

ئەم بەیانیە هیچ نامەیەك نەبووە.

※لەدوای none دەتوانین لە زێدەواژەی ofو جێناوی کارلێکراو کەڵك وەرگرین. وەك:

He told me all the problems, but none of them were very exciting.

ئەو هەموو گرفتەکانی پێ وتم بەڵام هیچکام لەوان زۆر سەرنج ڕاکێش نەبوون.

****هەرکات none of لەگەڵ ناوە نەژمێرداروەکان دا بێت پێویستە لـە فرمـانی تـاك دا کەڵك وەرگرین. وەك:***

I have a lot of work but none of them was done.

کارێکی زۆرم هەیە بەڵام هیچکامیان ئەنجام نەدراون.

****هەرکات لەگەڵ ناوە ژمێرداروەکانی کۆ بەکار بهێنرێن دەتوانین لە هەردووك فرمانی (تاك و کۆ) کەڵك وەرگرین.***

None of students <u>are</u> clever. — هیچکام لە قوتابیەکان زیرەك نین.

None of students <u>is</u> clever. — هیچکام لە قوتابیەکان زیرەك نین.

*هەرکات لەگەڵ ناوی کۆ وەك (group of people) بەشێك لە خەڵك یان بەشێك لە شت (group of things) بەکار بهێنرێ دەتوانین لە هەردووك فرمانی تاك و کۆ کەڵك وەرگرین. وەکوو:

None of her family have been to college.

هیچکام لە بنەماڵەکەی لە کۆلێژ نەبوون (نەبووە)

None of her family has been to college.

هیچکام لە بنەماڵەکەی لە کۆلێژ نەبوون (نەبووە)

## شێوەی بەکارهێنانی very – too – enough – so :

**١- *very*: ئەم وشەیە ئاوەڵفرمانەو لەپێش ئاوەڵناوە یان ئاوەڵفرمانێکی دیکە بەکار دەهێنرێ ئەم وشەیە پلەی ئاوەڵناو یان ئاوەڵفرمان دەباتە سەرێ یانی لەو رستانەدا بەکار دەبرێ کە دۆخی ئەرێ positive یان هەیە.** وەك:

She is very beautiful. ئەو زۆر جوانە.

***هەرکات لە رستەکەدا ناوی کارلێکراو وەك فرمانی نادیار (مجهول) بەکار بهێنرێ لەجێگای very دەبێ لە ( greatly, very much, much) کەڵك وەربگیرێ.**

Your help was very much appreciated.

یارمەتیەکەت زۆر ڕێزی لێ‌گیرا.

He was much loved by everyone.

ئەو لای هەموو کەسێك زۆر خۆشەویست بوو.

***very***: لەگەڵ ئاوەڵناوی پلەی بەرزدا بەکار دەهێنرێ بەلام لەگەڵ ئاوەڵناوی پلە نێونجی (much, very much) بەکار دەهێنین. وەك:

The very youngest children is my students.

کەم تەمەنترین منداڵەکان قوتابی منن.

Your work is very much better. کارەکەی تۆ زۆر باشترە.

*لەگەڵ ئەو ئاوەڵناوانەی کە مانای زۆر توند دەدەن وەك (تووڕەیی، سەرسوڕمان، سەرکەوتوویی، زۆر و . . .هتد) نابێ لە very کەڵك وەرگرین بەڵکوو لە جێگای ئەو دەبێ لە هێندێك ئاوەڵفرمانی‌تر وەك: ( really, completely, absolutely, etc) کەڵك وەربگرین.

She was absolutely furious. ئەو بە تەواوی تووڕە بوو.

You played really brilliantly.

بەراستی سەرکەوتووانە (زۆر بە باشی) یاریت کرد.

**<u>Very</u> لەگەڵ فرمانەکان بەکارناهێنرێ و لەجێگای ئەو دەبێ very much بەکار هێنرێ.**

We enjoyed staying with you very much.

زۆر پێخۆشحاڵین بە مانەوە لەگەڵ تۆ.

**٢- <u>too</u>: ئەم وشەیە لەپێش ئاوەڵناو بەکار دەهێنرێ و هەرکات فرمان لە دوایدا بێت بەشێوەی چاوگ بەکار دەهێنرێ و پلەکەی دێنێتە خوارێ.** وەکوو:

It's too late to do anything.

زۆر درەنگە تا بتوانین کارێك بکەین. (شتێك ئەنجام دەین)

The tea is too hot to drink. چایەکە زۆر گەرمە بۆ خواردنەوە.

*هەروەك لە دوو رستەی سەرەوەدا دیارە too پلەی رستەکانی نزم نرخاندووە. وەنە لە رستەی سەرەوەدا دەڵێ ئەوندە درەنگە کە هیچ کارێك ناکرێ و یان لە رستەی دووەم دەڵێ چایەکە ئەوەندە گەرمە کە ناخورێتەوە.

لەو رستانەدا کە بەدوای ئاوەڵناودا فرمان بەکار ناهێنرێ زیاتر مانای very دەدات. وەك:

This helping is too large for me. ئەم یارمەتی کردنە بۆ من زۆر بەنرخە.

لەجێگای too لە رستەکانی سەرەوەدا دەتوانین لە so و that بەو شێوەیە کەڵك وەرگرین.

It's <u>so</u> late <u>that</u> I can't do any thing.

ئەوندە درەنگە کە ناتوانم کارێك بکەم.

The tae is <u>so</u> hot <u>that</u> we can' t drink it.

چایەکە ئەوەندە گەرمە کە ناتوانین بیخۆینەوە.

**<u>گرینگ:</u>** *

**هەرکات لەدوای ئاوەڵناو لە and و بکەرو فرمان کەڵك وەربگیرێ بەکارهێنانی so,too و یان enough هەڵەیەو دە بێت ئاوەڵفرمانی very, quite بەکار بهێنرێت.**

He was very hungry and bought some bread.

ئەو زۆری برسی بوو برێك نانی کری.

enough-۳: ئەرکات ئەم وشەیە لە ڕستەدا هاتو بەدوای ئەودا فرمـان بـەکارهێنرابێ فرمانەکە دەبێ بەشێوەی چاوگ بێت. وەکوو:

There'll be time enough to relax when you finish.your work.

کاتێك کارەکەت تەواو کرد کات بۆ پشوودان دەبێت.

*دەتـوانین هێنـدێك جـار لـە enough بەپێچـەوانەی too و یـان so - that کـەڵك وەرگرین. وەك:

It's too late to do anything.

زۆر درەنگە تا بتوانین شتێك ئەنجام بدەین. (بۆنەوەی بتوانین شتێك بکەین زۆر درەنگە)

There is enough to do something.

بەتەواوی کات هەیە بۆ ئەوەی هێندێك شت بکەین.

*هەرکات ئەو یاسایە لە ڕستەدا بێت فرمان بەدوای ئەوان دا دەبێتە چـاوگ: (بەشـێوەی چاوگ بەکار دەهێنرێ)

ئاوەڵناو
so -------------- as + چاوگ
ئاوەڵفرمان

He spoke __so__ impolitely __*as*__ __*to annoy*__ everybody.

ئەو بەرادەیەك بێئەدەبانە قسەی کرد کە هەموو کەسی نیگەران کرد.

## __بەکارهێنانی still, yet, any more, any longer:__

__*still*__: بەمانی (هێشتا) لە ڕستە ئەرێکاندا لەدوای بکەر بەکاردەهێنرێو لەو ڕسـتانەدا کە فرمانی to be بەکار هێنراوە دەکەوێتە دوای ئەو فرمانەوە. وەك:

He is still working in his office.

ئەو هێشتا لە ئیدارەکەی خەریکی کارکردنە.

We still work hard every day.

ئێمە هێشتا هەموو ڕۆژێ کاری قورس دەکەین (بە قورسی کار دەکەین)

*Still* لە ڕستە پرسیاریەکانیش دا بەکار دەهێنرێ. وەك:

Do you still live at the same address?

ئایا تۆ هێشتا لەو شوێنە ژیان دەکەی؟

__*Yet*__: لـە کۆتـایی ڕسـتەکانی پرسـیاریو نـەرێ دەمـی ئێسـتای تـەواودا بـەکار دەهێنرێ.

Hasn't he finished his work yet? ئایا هێشتا کارەکەی تەواو نەکردوە؟

I haven't eaten my lunch yet. من هێشتا نەهارکەم نەخواردوە.

وە هەروەها ***yet*** لە ڕستەکانی دەمی ئێستای سادەدا بەکار دەهێنرێ. وەك:

Are you ready? ئایا تۆ ئامادەیت؟

No, not yet. نا هێشتا نا.

***Any more***: ئەم وشەیە فۆرمی نەرێی (still)ە کە لە زمانی کوردیدا بەمانای (ئیتر) بەکار دەهێنرێ‌و هێندێك جار لە ڕستە پرسیاریەکانیش دا بەکار دەهێنرێ.

She doesn't live here any more. ئەوە ئیتر لێرە ناژی.

Why doesn't he speak to me any more? بۆچی ئەو ئیتر قسەم لەگەڵدا ناکات؟

*دەتوانین لەجێگای any more لەبەرانبەرەکەی any longer لە کۆتایی ڕستە ...یکانداو یان لە no longer لە ڕستە نەرێکاندا بێئەوەی لە not کەڵك وەرگرین ڕستە ...انە نەرێ‌و لەپێش فرمانی ئەسڵی بەکاری بێنین کە لە کوردیدا مانای (چیتر) دەدەن.

I can't wait any longer. من ناتوانم چیتر چاوەڕێ بم.

She no longer lives here. ئەو چیتر (ئیتر) لێرە ناژی.

## بەکارهێنانی also, too, either, as well , as well as:

***also***: ئەم وشەیە لە ڕستە نەرێ( positive)ە کان دا بەکار دەهێنرێ‌و مانای (هەروەها)یش لەزمانی کوردیدا دەدات. شوێنی ئەم وشەیە لەدوای بکەرو لە ...ستەیەك دا فرمانی یاریدەدەر بەکار بێت لەدوای ئەو دایە: وەك:

She also speaks a little Italian. ئەو هەروەها تۆزێك ئیتالی قسە دەکات.

I can also play football. منیش دەتوانم یاری فوتبال (تۆپی‌پێ)بکەم.

***Too***: لە کۆتایی ڕستە نەرێ‌و پرسیارەکان دا بەکار دەهێنرێ. وەك:

Can I go to school too? ئایا منیش دەتوانم بێم؟

I go to school too. منیش دەچم بۆ قوتابخانە.

**as well**: ئەم وشەیەش هەروەك too لە کۆتایی ڕستە ئەریو پرسیارەکان دا بەکار دەهێنرێ. وەك:

I go to school as well.

**جیاوازی also, as well as, too, as well لە ڕستەدا:**

وشەی also باوترە لە هەردووك وشەی دیکەو لە پێوەندیە ڕەسمیەکاندا کەڵکی لێوەردەگیرێ too زیاتر لە قسەکردنی دۆستانەدا بەکاردەهێنرێو لەو حاڵەتەدا کەڵکی لێوەردەگیرێ.

***as well***: لە بریتانیا وەك too بەکاردەهێنرێ بەڵام لە ئەمریکا وەك وشەیەکی کۆن چاوی لێدەکرێ.

***as well as***: دەتوانین لەم وشەیە بەو شێوەیە کەڵك وەرگرین.

He gave me money as well as advice.

ئەو هەم پارەی پێدام هەم ئامۆژگاری کردم. (ئەو پارەی پێدامو ئامۆژگاریشی کردم)

***either***: ئەم وشەیە تەنیا لە کۆتایی ڕستەی ئەرێ negative ەکان دا بەکار دەهێنرێو لەراستیدا پێچەوانەی (too)ە.

I don’t go to school either.

منیش ناچم بۆ قوتابخانە.

**جیاوازی بەکارهێنانی little, a little:**

ئەم دوو وشەیە ئاوەڵناوی چەندایەتین quantitative adj. لەپێش ناوی نەژمێردراودا دێن. جیاوازییەك لەنێوان ئەم دوو وشەیەدا هەیە.

***Little*** : مانای زۆر کەم دەگەیەنێ وەك:

There is little water in the glass.

ئاوێکی کەم لە لیوانەکە دایە. (یانی بۆ خواردنەوە نابێ)

***A little***: مانای کەم دەدات بەڵام زۆرتر لە little: وەك:

There is a little water in the glass.

لیوانەکە ئاوی کەمی تێدایە. (بۆ ئەوە دەبێ بیخۆیتەوە)

جیاوازیەکی دیکە کە هەیانە little دەتوانرێ لەگەڵ ناوە ژمێردراوەکانیش بەکار بهێنرێ بەڵام ناکرێ لەو جۆرە ناوانەدا a litter بەکار بێنین. وەك:

ماڵی چورك litter house دەبێ بۆ پلەی نێونجیو بەرز لە smaller و smallest کەڵك وەرگرین. وەك:

A smaller house. — ماڵی چووکتر

The smallest house. — چووکترین ماڵ

## جیاوازی few, a few:

ئەم دوو وشەیە لەپێش ناوە ژمێردراوەکانی کۆدا بەکار دەهێنرێن. بەکارهێنانی ئەمانیش لە ڕستەدا وەك little, a little وایە.

Few رادەیەکی کەمتر لە a few پیشان دەدات. وەك:

Few students learn English.

بەکەمی خوێندکارەکان فێری ئینگلیزی دەبن.(زۆر کەم)

A few students learn English.

کەمێك لە خوێندکارەکان فێری ئینگلیزی دەبن.(زۆر کەم نین)

***هەرکات وشەکانی too یان very بکەونە پێش few , little رادەکەی زۆر دێنێتە خوارێ. وەك:**

there is very little water in the glass.

ئاوێکی زۆر زۆر کەم لە لیوانەکە دایە.

too few student learn English.

هەر زۆر بەکەمی قوتابیەکان فێری ئینگلیزی دەبن.

## شێوەی بەکارهێنانی much, many, a lot of, lots of :

***Much*: ئەم وشەیە بەمانای (زۆر) لەپێش ئەو ناوانەی ناژمێردرێن بەکار دەهێنرێ لە رستەی پرسیاریو (negative)ەکان دا کەلکی لێوەردەگیرێ.**

How much money do you have? تۆ چەندە پارەت هەیە؟

I don’t have much money. من پارەیەکی زۆرم نییە.

***Many*: ئەم وشەیە بەمانای (زۆر) بەپێچەوانە much لەپێش ئەو ناوانەدا دێ کە دەژمێردرێنو لە رستە نەرێ negative و پرسیاریەکان دا بەکار دەهێنرێ.**

How many parks has your town? شارەکەتان چەند باغی گشتی هەیە؟

Our town doesn’t have many parks. شارەکەمان باغی گشتی زۆر لێنیە.

* هەرکات لە رستەیەك دا فرمانی to be بەکارهێنرابێ کە رادەی شتەکان دیاری دەکاتو لەو رستەدا وشەکانی much و many بەکارهاتبێت لەگەڵ much فرمانەکە دەبێ تاك بێتو لەگەڵ many دەبێ کۆ بێت.وەکوو:

There isn’t much money. پارەی زۆری لێنیە.

There aren’t many books. کتێبی زۆری لێنیە.

※ لە رستە نەرێکان دا لەجێگای a great deal of much, وە یان a large a mount of بەکار دێنینو لەجێگای many لە a large number of کەڵك وەردەگرین، بەڵام ئەم شێوازانە لە نووسین دا زیاتر بەکار دەهێنرێن بەتایبەت لە بریتانیا.

## :A lot, lots

**ئەم دوو وشەیە لە رستەی ئەرێ positive لەجێگای much و many بەکار دەهێنرێن هەم لەو رستانەدا کە ناوەکانیان ناژمێردرێنو هەم لەو رستانەدا کە ناوەکانیان دەژمێردرێن.**

I have lots of money. من پارەی زۆرم هەیە.

My town has a lot of parks. شارەکەی من باغی گشتی زۆرە.

ئەم وشانە زیاتر لە قسەکردندا بەکاریان دێنین بەڵام بۆ نووسین هەروەك وتمان ئەو وشانەی سەرەوە بەکار دێنین.

وشەکانی lots و a lot هەرکات لەپێش ناوەوە بەکار بهێنرێن دەبێ (of)یان لەگەڵدا بێت بەڵام هەرکات پێش وشەکانیتر یان کۆتایی رستە بەکار بهێنرێت پێویست بە of ناکات.

He speaks a lot in the class. ئەو لە پۆل زۆر قسە دەکات.

He travels a lot. ئەو زۆر سەفەر دەکات.

ئەو حاڵەتانەی سەرەوە لەهەردوو رستەدا a lot وەك ئاوەڵفرمانێك کەڵکی لێوەرگیراوە بۆ ئەو حاڵەتە ناتوانین لە رستە negativeو پرسیاریەکان دا much لەنێوەراستی رستەدا بەکار بهێنین بەڵکوو دەکەوێتە کۆتایی رستەوە. وەك:

I didn't enjoy the film very much. من فیلمەکەم زۆر پێخۆش نەبوو.

## بەکارهێنانی :each, every

وشەی each لەپێش ناوە تاکەکان بەکار دەهێنرێو ئەو فرمانە بەدوایدا دێت تاکە.

Each book is good. هەر کتێبێك چاکە.(مەبەست هەموو کتێبێك)ە.

※هەرکات بەدوای بکەرێکی کۆدا بێت فرمانی هاوڕێی کۆیە.

They each have their own car. ئەوان هەرکام ئوتومبیلی خۆیان هەیە.

وشەی every هەمووکات فرمانەکەی تاکەو ئەو ناوەی بەدوایدا دێت بەشێوەی تاك بەکار دەهێنرێ.

Every student in the class is class is capable of passing the exam.

هەموو خوێندکارەکانی پۆل شایانی ئەوەن لە تاقیکردنەوە دەرچن.

وشەکانی each of, each one of, every one of هەرکات لە ڕستەدا بێن ناو یان جێناوەکەیان کۆیە بەڵام فرمانەکەیان زۆرتر تاکە. وەك:

Each one of the houses was slightly different.

هەرکام لە خانووەکان تۆزێك جیاوازیان بوو.

I bought several eggs and every one of them was bad.

من چەند هێلکەیەکم کڕیو هەموو ئەوان خراپ بوون. (هەرکام لەوان خراپ بوون)

## جیاوازی بەکارهێنانی each other لەگەل one another:

***Each other***: هەرکات لەرستەدا بێت هێما بەدوو کەس دەکات. وەکوو:

Kamaran and Sozan really love each other . (he loves her and she loves him)

کامەرانو سۆزان بەڕاستی یەکتریان خۆش دەوێ.

***One another***: ئەم وشەیە هێما بەدوو کەس زیاتر دەکات. وەکوو:

We all help one another. ئێمە هەموومان هاوکاری (یارمەتی) یەکتر دەکەین.

## شێوەی بەکارهێنانی other, another, others :

***Other***: ئەم وشەیە بۆ جیاوازی یان زیاتر پیشاندانی خەڵكو شتەکان بەکار دەهێنرێ. وەك:

Mr. Harris andMrs. Bate and three other teachers were there.

(مستێر) هاریسو (میسس) بەیتو سێ مامۆستاکانیتر لەوێ بوون.

*هەرکات ئەم وشەیە the لەگەڵدا بێت وەك ئاوەڵناوی نادیار دەتوانین لەگەڵ ئەو ناوانەی کە دەژمێردرێنو ئەو ناوانەیش کە نازمێردرێن بەکاری بێنین ئەو فرمانەی لەگەڵیدا دێت بەپێی ناوەکە کۆیە یان تاکە.

I don't want this shirt please give me the other shirt.

**وشەی** another one **لەجێگای جێناو بەکار دەهێنرێ.**

I don't want this shirt please give me an other one..

من ئەو کراسەم ناوێ تکایە ئەوەی کەم بدەیە.

وشەی another لەجێگای ناوەڵناو بەکار دەهێنرێ‌و دەتوانین بەو شێوانە کەڵکی لێوەرگرین.لەگەڵ ناوێکی تاك بەکاردەهێنرێ‌و فرمانی تاکە. وەك:

We need another computer.

ئێمە پێویستمان بە کۆمپیوتەرێکی دیکەیە.

***دەتوانین بەم یاسایە بەکاری بێنین:*** ناوی کۆ + another + of وەك:

I bought another of those shirts. من یەکێکی‌تر لەو کراسانەم کڕی.

***دەتوانین بەم یاسایەش بەکاری بێنین.*** ناوی کۆ + another +number وەك:

I have another three questions to answer.

من سێ پرسیاری ترم هەیە وەڵامی بدەمەوە.

## جیاوازی one, ones:

ئەم وشانە جێ‌ناوی ئاماژەن‌و بۆ بەرگری لە دووپات بوونەوەی ناو بەکار دەهێنرێن.

وشەی one جێگری ناوی تاکە. وەك:

This book is good and I will read that one.

ئەم کتێبە چاکەو من ئەو یەکەیان دەخوێنمەوە.

وشەی ones جێگری ناوی کۆیە . وەك:

I don't want these applies I want those ones.

من ئەم سێوانەم ناوێ، ئەوانەم دەوێ.

وشەی one of هەرکات لەگەڵ ناوێکی کۆ بەکار بهێنرێ‌و لە ڕستەکەدا who, that وەك جێ‌ناوی پێوەندی بەکار بهێنرێن فرمانێك بەدوایدا دێت کۆیە. وەك:

This is one of those students who work hard.

ئەمە یەکێك لەو خوێندکارانەیە بە قورسی کار دەکات.

This is one of my friends who I like him.

ئەمە یەکێك لەو هاوڕێیانەی منە کە خۆشم دەوێ.

وشەی one بەدوای جێ‌ناوەکان هەروەها some‌و any و ژمارەکان بەکار ناهێنرێ. وەك:

We'd like to exchange our house with that of a British family.

ئێمە دەمانەوێ ماڵەکەمان لەگەڵ ماڵی خزمێکی بریتانیایی بگۆڕینەوە.

لەو ڕستانەدا ناتوانین بەشی کۆتاییەکەی بەو شێوەیە بنووسین.

~~We'd like to exchange our house with a British family's one.~~ ✗

## چۆنیەتی بەکارهێنانی as, as if, as though, the same :

**As**: لەو حاڵانەی ژێرەوەدا بەکار دەهێنرێ.

I respect him as a doctor.

وەك: "زێدە واژە" من وەك پزیشکێك ڕێزی دەگرم.

It's not as hard as I thought.

وەك: "ناوەڵفرمان" بەو جۆرەی من بیرم دەکردەوە ناخۆش نیە.

I can't go out as I stay home and study my lesson.

وەك: "وشەی پێوەندی" ناتوانم بێمە دەرێ چونکە لە ماڵەوە دەمێنیمەوەو وانەکەم دەخوێنم.

Asلەجێگای although بەکاردەهێنرێ بەڵام دەکەوێتە دوای ناوەڵناوەوە. وەك:

Happy as they were, there was some thing missing.

Although they were happy, there was some thing missing.

هەرچەند دڵخۆش بوون بەڵام شتێك بوو کە دەشاردراوە. (شتێکیان دەشاردەوە).

وشەکانی as though و as if بەمانای (تۆ بڵێی، ئەڵێیو وەك ئەوەی) لە زمانیکوردیدان بۆ ئەم حاڵەتە ئەگەر ڕستەکەمان ئێستا(ڕانەبردوو) بێت فرمانێك کە بە دوایاندا دێ ڕابردووە و هەرکات ڕستەکەمان ڕابردوو بێت فرمانەکە ڕابردووی دوورە.وەك:

It's my birthday as though you didn't know.

ئەمڕۆ ڕۆژی لەدایك بوونی منە ئەڵێی نازانی. (وەك ئەوەی نایزانی)

He behaved as if nothing had happened.

ئەو وا هەڵسوکەوتی کرد وەك ئەوەی هیچ نەقەومابێ.

**هەرکات بەدوای the same دا as بەکار بهێنرێ بەمانای (هەروەك، وەك، لە)یە.**

I would like one the same as yours.

من دانەیەکەم وەك ئەوەی تۆ پێباشە.

دەتوانین لە the same as بۆ پیشاندانی بەرانبەری پێوانەکان کەڵك وەرگرین.

Sexty minutes are the same as one hour.

شەست خولەك بەرانبەرد لەگەڵ یەك کاتژمێردا.

***

## شێوەی بەکارهێنانی like , alike , similar , similar to:

**Like**: ئەم وشەیە چەندین مانای جۆراوجۆری لەزمانی ئینگلیزیدا هەیە.(زێدەواژە، ئاوەڵناو، ئاوەڵفرمان، فرمان، وشەی پێوەندی، ناو) وەك هەمووی ئەوانە لە رستەدا بەکار دەهێنرێو چەندین مانای جۆراوجۆری هەیەو لە ڕێزمانی ئینگلیزیدا گرینگی پێدەدرێ.

لێرەدا باسی دۆخی (زێدەواژە)ی ئەم فرمانە دەکەینو لە درێژەی باسەکەمان داو ئەوندەی پێویست بێت باسی بەشەکانی دیکەی ئەم وشەیە دەکەین.

***what .... Like***: **هەرکات وشەی like بەو شێوەیە لە رستەدا بەکار بهێنرێ پرسیار دەکات لەبارەی کەسێك یا شتێکەوە کە دەیهەوێ زۆرتر لەبارەیەوە بزانرێت. وەك:**

What are his parents like? باوكو دایکی ئەو چۆنن؟

They are very kind. ئەوان زۆر دڵسۆزن.

لەو شێوازەدا کە باسمان کرد جیاوازە لەگەڵ هەواڵپرسین یان سلاو کردن. وەك:

How is your mother?

حاڵی دایکت چۆنە؟(پرسیار دەکات لەبارەی سلامەتیەوە)

she is fine. باشە (شێوەی وەلام دانەوە)

What is you mother like?

دایکت چۆنە؟ (دەیهەوێ زۆرتر لەبارەی ئەوەوە بزانێت)

She is kind, and she has lovely blue eyes.

ئەو دڵسۆزەو چاوەکانی شینو سەرنج راکێشن.( چاوی شینو سەرنج راکێشی هەیە)

***Like*** **بەمانای (وەك، وەکوو) بەکار دەهێنرێ.**

She looks nothing like her mother.

ئەو هیچی لە دایکی ناچێ (بە هیچ شێوەیەك لە دایکی ناچێت)

بۆ ئەم حاڵەتە دەتوانین وشەی as یش بەکار بێنین بەلام جیاوازیەکیان هەیە.

***Like***: زێدەواژەیە لەپێش ناو یان جێناوەکان دا بەکاردەهێنرێ، بەلام as وشەی پێوەندی (لکاو)ەو هەروەها ئاوەڵفرمانەو لەپێش – بەشێك لە رستە، ئاوەڵفرمانێکیتر یان بەشێك لە رستە کە بە زێدەواژە دەست پێدەکات بەکار دەهێنرێت. وەك:

He has blue eyes like me. ئەو چاوەکانی وەك من شینن.

She enjoys all kind of music as I do.

ئەو هەموو بەشەکانی مۆسیقای وەك من پێخۆشە.

لەو حاڵەتانەدا کە like وەکوو وشەی لکاو بەکار دەهێنرێت دەتوانین لەجێگای ئەو as بەو شێوەی سەرەوە بەکار بێنین. بەڵام ئەو شێوازە لە قسەکردنی خۆماڵی یان دۆستانەدا باوەو لە پێوەندییە ڕەسمییەکان دا کەڵکی لێوەرناگیرێ. وەکوو:

Nobody understand him like I do . هیچ کەس وەك من لێی تێناگات.

**وشەی like دەکرێ لەجێگای as if، as though، کەڵکی لێوەربگیرێ. بەڵام لە قسەکردندا زیاتر باوە بەتایبەت لە ئامریکا.**

She behaved like nothing had happened.

ئەو وا هەڵسوکەوتی دەکرد وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت. (لەپێش دا باسی چۆنیەتی دروست بوونی ئەم ڕستەیەمان کردووە)

***alike*: ئەم وشەیە بەمانای (وەکوو یەك، وەك یەك) بەکار دەهێنرێ و دەکەوێتە کۆتایی ڕستەکانەوە. وەك:**

They tried to treat all their children alike.

ئەوان تێدەکۆشان کە هەموو منداڵەکانیان وەك یەك چاو لێبکەن.

***Similar to –similar*: ئەم وشانە جێگای like و alike دەگرنەوە. وشەی similar لە نێوەڕاستی ڕستەدا دێت و جێگای like دەگرێتەوە. دیارە بەمانای وەك ، وەکووا "بەڵام نەك بەتەواوی" بەکار دەهێنرێ. وەك:**

My teaching style is similar to that of most other teacher.

شێوەی وانە وتنەوەکەی من وەك زۆرینەی مامۆستاکانی ترە.

هەرکات similarبکەوێتە کۆتایی ڕستەوە مانای alike دەدات. وەك:

The brothers look very similar. براکان زۆر وەك یەك دەچن.

## چاوگ Infinitive:

هەروەك لە باسی فرمانەکان دا بەکورتی باسی چاوگ مان کرد، کە ریشەی هەموو فرمانێکەو پاشان باسی لق و پۆپەکانیمان کرد کە دەمەکانی لێ‌دروست دەکرێ. ئێستاش بە ووردی باسی چاوگ دەکەین و ئەم خاڵە گرنگەی ڕێزمانی ئینگلیزی چاکتر روون دەکەینەوە.
چاوگ بەڕێوەچوونی کارێك بەمانایەکی گشتی بەیان دەکات و سەر بە هیچ دەمێك نیە. دەتوانین بۆ دروست کردنی هەموو دەمەکان کەڵکی لێ‌وەرگرین، دیارە بە دەستکاری کردنی بەپێی رستەکە.
هێندێك جار پێویستە لە رستەدا چاوگ وەك خۆی بنووسین یان نیشانەی چاوگ کە (to)ە لەپێش فرمان بەکاربهێنرێت.

### شێوەی بەکارهێنانی چاوگ:

هێندێك جار لە رستەیەك دا دوو فرمانی ئەسڵی بەدوای یەك دا بەکار دەهێنرێن، فرمانی یەکەم بەپێی دەمی رستەکە ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت و فرمانی دوای خۆی دەتوانێ بە دوو شێوە بەکار بهێنرێ، کە یەکێك لەوان بەشێوەی چاوگە.

**١)ژمارەیەك لەو فرمانانەی‌کە بەدوایاندا چاوگ بەکار دەهێنرێت بریتین لە:**

1- promise 2- forget 3- want 4- like 5- swear 6- agree
7- refuse 8- fail 9- hope 10- hesitate 11-would like
12- pretend 13- learn 14- decide 15- make a decision
16- plan 17-determine 18- understand 19- seem
20- manage 21- try 22- attempt 23- expect 24- wish
25- be afraid 26- afford 27- permit 28- allow

**ئەمانە بەشێك لەو فرمانانەن کە بەدوایاندا چاوگ بەکار دەهێنرێت. وەك:**

I want to read the newspaper.

من دەمەوێ رۆژنامە بخوێنمەوە.

**٢-لەدوای ئەم فرمانانەی خوارەوە کارلێکراو پاشان چاوگ بەکار دەهێنرێت.**

1-order 2-expect 3-tell 4-ask 5-want 6-advise 7-tempt
8-forbid 9-allow 10-persuade 11-recommend 12-beg 13-commend
14-teach

I wanted <u>him</u> <u>to go</u>. من دەمەویست ئەو بڕوات.

**※ دەتوانین لەدوای ئەو فرمانانەی ناومان برد لە چاوگی negative کەڵك وەرگرین وەك:**

He asked me not to come here. ئەو تکای لە من کرد نەیەم بۆ ئێرە.

**٣-لەپاش ئاوەڵناو دەتوانین لە چاوگ کەڵك وەرگرین. وەك:**

It's hard to translate this sentence. وەرگێڕانی ئەم ڕستەیە زۆر ناخۆشە.

**٤-لەدوای وشەکانی where, what, which, whom, when کە وەك وشەی ناو لەنێوەڕاستی ڕستەدا بەکار بهێنرێن چاوگ بەکار دێت.**

I don't know which one *to buy*. نازانم کامیان بکڕم.

I can't decide what *to say*. من ناتوانم بڕیار بدەم کە بڵێم چی.

**٥-لەدوای وشەی how فرمان بەشێوەی چاوگ بەکار دەهێنرێ. وەك:**

Do you know how *to go* there? ئایا دەزانیت چۆن بۆ ئەوێ بڕۆیت؟

**٦-بۆ وەڵام دانەوە بە پرسیارەکان بۆ پیشاندانی هۆی ئەنجام دانی کارێك چاوگ بەکار دێنین.**

Why did you go to England? بۆچی بۆ ئینگلیز چوویت؟

I went to England *to learn* English.

من چووم بۆ ئینگلیز بۆئەوەی ئینگلیزی فێر بم.

**٧-لەدوای ئاوەڵفرمانی شوێن و کات، حاڵەت، it's time لە چاوگ کەڵك وەر دەگرین.**

I went shopping yesterday *to buy* something.

دوێنێ چووم بۆ بازاڕ بۆ کڕینی هێندێك شت.

I go to kitchen *to have* my breakfast.

من دەچم بۆ دیوی چێشت لێنان بۆئەوەی بەیانیەکەم بخۆم.

He drives the car quickly *to arrive* early.

ئەو ئوتومبیلەی بەخێرایی لێ‌خوڕی بۆئەوەی بە زوویی بگات.

It's time to begin. ئێستا وەختی دەست پێ‌کردنە.

**٨-لەدوای وشەکانی the first, the second, the last فرمان بەشێوەی چاوگ بەکار دەهێنرێ.**

She was the second *to arrive*. ئەو دووەمین کەس بوو کە گەیشت.

**※هەرکات بەدوای ئەو وشانەدا ناو بەکار بهێنرێ دەبێ بەو شێوەی خوارەوە بنووسرێ.**

She was the last person ***that arrived***. ئەو ئاخرین کەس بوو کە گەیشت.

## هێندێک خاڵی گرینگ بۆ بەکارهێنانی چاوگی بێ to:

هەروەك لەپاش هێندێك فرمان پێویستە لە چاوگ کەڵك وەرگرین لەپاش هێندێك فرمانیش دەبێ چاوگی بێ to بەکار بهێنین. ئەو فرمانانە کە زیاتر پەیوەندیان بە حاسە (حواس)و تێگەیشتنەوە هەیە. بە دوو جۆر دابەش دەکرێن.

**جۆری یەکەم:**

ئەو فرمانانەن کە لەدوای ئەوان سەرەتا لە کارلێکراو و پاشان یان لە چاوگی بێ to , یان لە (ing+ فرمان) کە کەڵك وەردەگرین. وەك:

***See, watch, observe, notice, hear, feel***

وەکوو:

I saw him go quickly. — من دیم بە خێرایی دەڕۆیشت.

I saw him ***going*** quickly.

**جۆری دووەم:**

ئەو فرمانانەن کە بە دوایان داکارلێکراو و پاشان تەنیا دەبێ لە چاوگی بێ to کەڵك وەرگرین بریتین لە : Let, make, have, help

I let them go. من ئیجازەم پێدان بڕۆن.

لێرەدا بۆ فرمانی have مەبەست لەو کاتانەیە کە وەك فرمانی ئەسڵی بەکار دەهێنری دەنا لەدوای هەر فرمانێکی یاریدەدەر چاوگی بێ to بەکار دەهێنرێ. وەك:

I went to have everything ready in good time.

بەدوای helpدا دەتوانین لە چاوگیش کەڵك وەرگرین. وەك:

She helped me *answer* that question.

She helped me *to answer* that question.

ئەو یارمەتی دام وڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە.

## ناوی چاوگ :Gerund

هەرکات بمانەوێ بە مانایەکی گشتی باس لە شتێك بکەین پێویستە لەناوی چاوگ کەڵك وەرگرین بۆوێنە هەرکات بمانەوێ بڵێین (هەڵاتن بۆ لەش ساغی تۆ قازانجی هەیە) هیچ ئاماژەیەك بە دەمی ڕستەکە ناکەین بەڵکوو وشەی هەڵاتن بە مانایەکی گشتی باس دەکەین کە لە ئینگلیزیدا بەو شێوەیە دەنووسرێ.

Running is good to your health.

**هۆکانی بەکارهێنانی ناوی چاوگ:**

١-وەك بکەر لە ڕستەدا:

Drinking wine isn't good for you. ئارەق خواردنەوە بۆ تۆ چاك نیە.

٢-وەك کارلێکراو لە ڕستەدا:

I finished working early last night. من دوێنێ شەو زوو کارەکەم تەواو کرد.

٣-وەك ئاوەڵناو لە ڕستەدا:

This learning English is easy. ئەم فێربوونی ئینگلیزییە ئاسانە.

٤-هێندێك جار دوای زێدەواژەکان بەکار دەهێنرێ:

Several people were hit by jumping glass.

چەند کەس بەهۆی پەڕینی شووشەوە بریندار بوون.

٥-لەدوای ئاوەڵناوی خاوەنداریەتی:

I don't notice your speaking. ← من لە قسەکردنی تۆ تێناگەم.

٦-لەدوای ئەو فرمانانەی ژێرەوە:

*stop, finish, prevent, avoid, risk, postpone, enjoy, appreciate, mind, consider, deny, admit, dislike, detest, suggest, forgive, resist, involve, dread , practise, anticipate, be used to, be accustomed, get used to, be afraid of, look forward to, can't help, can't stand, it's no use, be busy, quit, feel like, it's no good.*

I can't quit ***smoking***. من ناتوانم لە جگەرە کێشان دەست هەڵگرم.

I want to practise ***speaking*** English.

من دەمەوێ لەسەر قسەکردنی ئینگلیزی مەشق بکەم.

لەدوای فرمانی go زۆرجار ناوی چاوگ بەکار دەهێنرێ کە گرینگترینیان ئەمانەن.

go fishing, go shopping, go swimming, go climbing

لەدوای هێندێك فرمان دەتوانین ناوی چاوگ بەکار بێنینو هەروەها دەتوانین لە چاوگیش وەرگرین. ئەو فرمانانە بریتین لە:

*start, continue, like, hate, love, prefer, forget, begin, try, propose, attempt, neglect, remember.*

She began to cry. = She began crying.

ئەو دەستی بە گریان کرد.

فرمانی like هەرکات بە مانایەکی گشتی بەکار بهێنرێ بە دوایدا ناوی چاوگ بەکار

I don't like smoking cigarette. من جگەرە کێشانم پێخۆش نیە.

هەرکات بەدوای tryدا چاوگ بەکار بهێنرێ try مانای (تێکۆشان، هەوڵدان) دەدات بەڵام هەرکات ناوی چاوگ بەکار بێت مانای (تاقیکردنەوە) دەدات. وەك:

You should try to eat more fruit. تۆ دەبێ تێبکۆشی میوەی زیاتر بخۆیت.

You should try eating more fruit.

تۆ دەبێ بۆ تاقیکردنەوە میوەی زیاتر بخۆیت

وشەی propose هەرکات بەدوایدا چاوگ بەکاربهێنرێ مانای (ویستن، نیازکردن) دەدات بەڵام هەرکات ناوی چاوگ بە دوایدا بێت مانای (پێشنیار کردن) دەدات. وەك:

What do you propose to do now? نیازت وایە ئێستا چی بکەیت؟

He proposed changing the name of the company.

ئەو پێشنیاری گۆرینی ناوی کۆمپانیاکەی کرد.

## : The Participles (وجه وصفی) گرێی ناوەڵناوی

ئەو وشەیەی کە دۆخو چۆنیەتی کارێك بەشێوەی راستەقینە دەهێنێتە بەر باس پێی دەڵێن گرێی ئاوەڵناوی بۆ دروست کردنی دەبێ لە ( ing+فرمان) کەڵك وەرگرین.

لەپێش دا و لەباسی ناوی چاوگ دا باسمان کرد هەرکات فرمان ing وەربگرێ بەمانایەکی گشتی بەکار دەهێنرێ بەڵام لەم حاڵەتەدا بەمانای گشتی بەکار ناهێنرێ بەڵکو نیشاندەری بەرێوەچوونی راستەقینەی کارێکە.

The young running is my friend. ئەو لاوەی کە هەڵدێ هاورێی منە.

لێرەدا running بەرێوەچوونی کارێك وەسف دەکات کە لەگەڵ ئەو رستەی خوارەوە جیاوازیەکی زۆری هەیە کە بە مانایەکی گشتی باس لە running دەکات.

Running is good to your health. هەڵاتن بۆ لەش ساغی تۆ باشە.

**گرێی ئاوەڵناوی بە سێ جۆر دابەش دەکرێن کە بریتین لە:**

**١- گرێی ئاوەڵناوی ئێستا Present Participle:**

ئەم شێوازە بە چوار جۆر دابەش دەکرێ.

a-وەك ئاوەڵناو

The hotel has a swimming pool.

هوتێلەکە حەوزێکی مەلەکردنی هەیە.

b-لە دەمەکانی ئێستاو رابردووەکانی بەردەوام دا بەکار دەهێنرێ.

I am playing tennis. من خەریکی یاری کردنی تینیسم.

c-لەدوای هێندێك فرمان کە پەیوەندیان بە تێگەیشتنو حاسە (حواس)ەوە هەیە.
I head my teacher speaking to you.

من گوێم لێبوو مامۆستاکەم قسەی بۆ دەکردی.

d-بەکارهێنانی راستەوخۆ دوای بکەر.

Shawnem, studying her lessen want to be doctor.

شەونم بە خوێندن دەیەوێ ببێتە پزیشك.

**٢- گرێی ئاوەڵناوی تەواو Prefect Participle:**

ئەم شێوازە کاتێك بەکار دەهێنرێ کە بەڕێوەچوونی کارێك بەدوای کارێکی دیکەدا رووبداتو زیاتر لە رستەکانی رابردووی دووردا بەکاردەهێنرێت، بۆ دروست کردنی دەبێ لە having لەگەڵ ناوی کارلێکراو کەڵك وەرگرین. وەك:

Having seen him, she went out.

پاش ئەوەی کە چاوی پێی کەوت چووە دەرێ.

***دەتوانین بەو شێوەیەش بەکاری بێنین.***

After having seen him, she went out.

دەتوانین لە رستە نادیارەکان (مجهول) بەهێنانی been بەو شێوەی خوارەوە بەکاری بێنین.

After having been invited by their friend, they wore new clothes.

دوای ئەوە کە لەلایەن هاورێکەیانەوە بانگهێشت کران، جلە نوێیەکانیان لەبەر کرد.

**٣- گرێی ئاوەڵناوی رابردوو یان ناوی کارلێکراو Past Participle:**

ناوی کارلێکراو هەروەك لەپێش داباسمان کردووە بۆ چ دەمێك بەکار دەهێنرێ. دەتوانین لەجێگای ئاوەڵناویش بەکاری بێنین. وەك:

I was hit by broken glass. بە شووشەی شکاو بریندار بووم.

When I came home, she had broken the glass.

کاتێك هاتمەوە بۆ ماڵی ئەو شووشەکەی شکاندبوو. (وەك ناوی کارلێکراو)

## شێوەی بەکارهێنانی such:

ئەم وشەیە لەپێش ناو یان ناوێك کە لەگەڵ ناوڵناو بەکار دەهێنرێ کەڵکی لێوەردەگیرێ هەرکات بەدوای such دا a بەکار بهێنرێ لەپێش ناوی تاك بەکار دەهێنرێ. وەك:

I had never seen such a book. من تا ئێستا کتێبێکی ئاوام نەدیبوو.

I have never seen such beautiful flowers.

من هێشتا گوڵی وا جوانم نەدیوە.

وشەی such as بەو دوو شێوەی خوارەوە بەکار دەهێنرێ.

Flowers such as these = Such flowers as these

گوڵی وەك ئەمانە (وەك ئەم گوڵانە)

## شێوەی بەکارهێنانی there is – there are:

بۆ ئاماژە کردن بە هەبوونی شتێك یان کەسێك لە زمانی ئینگلیـزیدا کـەڵك لـەو دوو وشەیە وەردەگرین.

***There is***: لەپێش ئەو ناوانەدا کە ناژمێردرێن و هەروەها ئەو نـاوە تاکانـە کـە دەژمێردرێن. وەك:

There is a book in my bag. کتێبێك لە جانتاکەی من دایە.

There is some milk in the bottle. قاپەکە برێك شیری تێدایە.

***There are***: لەپێش ناوە کۆکان دا بەکار دەهێنرێ.

There are three men in that room. ئەو دیوە سێ پیاوی لـێیە.

بۆ پرسیار کردن دەبێ is, are بێنینە پێش there ەوە.

Is there a book on the table? ئایا لەسـەر کورسی‌یەکە کتێبێکی‌لـێیە؟

Are there children in the room? ئایا منداڵەکان لە دیوەکەن؟

## چۆنیەتی بەکارهێنانی either, neither, both:

ئەم وشانە لە رستەدا هەم وەك جێناوو هەم وەك ناوەڵناو کەڵکیان وەدەگیرێ دیارە پێش تر باسمان کرد کە either, neither چـۆن وەك ناوەڵفرمانێـك بـەکار دەهێنـرێن. لێرەدا باسی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو وشـانە وەکـوو جێنـاو و ناوەڵنـاو دەکـەین کـە جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ دۆخی ناوەڵفرمانەکانیان هەیە.

***Either***: ئەو وشەیە ئاماژە بەدوو کەس یا دوو شت دەکاو بە مانای (هەرکامیان) لە کوردیدا بەکار دەهێنرێ. وەك:

You can park the car on either side of the street.

تۆ دەتوانی هەر لە بەرێکی شەقامەکەدا ئوتومبیلەکەت راگریـت.(مەبەسـت لـە هـەر بەرێك کە دەتەوێت)

Would you like tea or coffee? تۆ چایت دەوێ یان قاوە؟

I wouldn't like either. من هیچکامیانم پێخۆش نیە.

***Neither***: ئاماژە بە دوو شت یا کەس دەکات لەم دۆخەدا لە فرمانی نەرێ negative کەڵك وەرناگرین چونکە بۆ خۆی رستەکە negative دەکات. وەك:

Neither candidate was selected for president.

هیچ پاڵێوراوێك نەبوو بە سەرۆك کۆمار.

Which one do you like? کامیانت خۆش دەوێ؟

Neither. I think they are both ugly.

هیچ کامیان. پێم وایە هەردووکیان ناشیرینن.

*هەرکات بەدوای either of – neither of دا ناوێکی کۆ یان جێناوێکی کۆ بەکار بهێنرێ دەتوانین هەم فرمانی تاكو هەم کۆ بەکار بێنین. وەك:

Neither of my friends <u>speak</u> English.

هیچ کام لە هاوڕێکانم بە ئینگلیزی قسە ناکەن.

Neither of my friends <u>speaks</u> English.

هیچ کام لە هاوڕێکانم بە ئینگلیزی قسە ناکەن.

***Both***: ئەم وشەیە بۆ دوو شت یان دوو کەس بەکار دەهێنرێ ئەو فرمانانەی لەگەڵیدا بەکار دەهێنرێ هەمووکات کۆیە. وەك:

I have two sisters both of them live in London.

من دوو خوشکم هەیە هەردووکیان لە لەندەن دەژین.

They both live in London. ئەوان هەردووکیان لە لەندەن دەژین.

We have both seen the film. ئێمە هەردووکمان فیلمەکەمان دیوە.

## <u>شێوەی بەکارهێنانی (either.....or) (neither......nor) (both....and)</u>

***Either***: ئەووشەیە هەرکات لە رستەدا بەکاربهێنرێ و بەدوای ئەودا ناوێك پاشان orو بەدوای ئەویش دا ناوێکیتر بێت مانای (یان ...یان)لەزمانی کوردیدا دەدات.

I am going to <u>either</u> a camera <u>or</u> a CD player with the money.

من نیازم وایە بە پارەکە یان کامێرایەك یان سی‌دی‌یەك بکرم.

***Neither.....nor***: هەرکات لە رستەیەکدا neither جێگای either بگرێتەوە و لەجێگای or بەکاربهێنرێ مانای (نە.....نە)دەدات. وەك:

<u>Neither</u> the TV <u>*nor*</u> the video actually works.

بەراستی نە تەلەفیزیۆنەکەو نە ویدیۆکە کار ناکەن.

*لەو رستانەدا(neither .....nor) (either .... Or) بەکار بهێنرێ دەتوانین لە ...ك فرمانی تاك یان کۆ کەڵك وەرگرین. وەك:

<u>Neither</u> the TV <u>*nor*</u> the video work.

نە تەلەفیزیۆنەکەو نە ڤیدیۆکە کار ناکەن

***<u>Both ... And</u>***: هەرکات ئەم وشانە لە ڕستەدا بەکار بهێنرێن مانـای ( هـەم .. هـەم) دەدەن.

Both his father and his mother were here. هەم باوکیو هەم دایکی لێرە بوون.

## بەکارهێنانی (also) not only ..... but:

بەکار هێنانی ئەم وشانە لە ڕستەدا بەمانای گشتی بەرانبەرە لەگەڵ both .... And بەڵام بەشێوەیەکیتر بەیان دەکرێ. وەك:

He <u>not only</u> read the book, <u>but also</u> remembered what he had read.

ئەو نەك هەر کتێبەکەی خوێندەوە بەڵکوو لە بیریشی بوو چی خوێندبووەوە.

He <u>both</u> read the book <u>and</u> remembered what he had read.

ئەو هەم کتێبەکەی خوێندەوە هەم لە بیریشی بوو چی خوێندبووەوە.

*هەرکات فرمانی یاریدەدەر لە ڕستەدا بەکار بهێنرێ دەکەوێتە دوای بکەرەوە. وەك:

I can not only speak English, but also write.

من نەك هەر دەتوانم بە ئینگلیزی قسە بکەم بەڵکوو دەتوانم بیشی نووسم.

## وشەی پەیوەندی Connective Word:

وشەی پەیوەندی بریتیە لەو وشانە کە دوو ڕستەی جیاواز، یان وەك یەك پێکەوە پەیوەند دەکات.

لێرەدا باسـی چەند وشـەی پەیوەندی گـرینگ کـە لـە ئینگلیـزیدا بـەزۆری بـەکار دەهێنـرێنو دەتوانن لەجێگای یەکتر دایان نێین دەکەین.

**:Consequently, as a result, thus, therefore, so**

ئەو وشانەی سەرەوە کە مانای (کەواتە، بەو هۆیـە، لەبەرنـەوەی، بـەو شـێوەیە) دەدەن زیاتر لەنێوان دوو ڕستەدا بەکار دەهێنرێن کە ڕستەیەکیان ڕستەکەی دیکە دەسەلمێنێ. وەك:

He made one big mistake, ***so***, lost his job.

***there fore***
***thus***
***as a result***
***consequently***

ئەو هەڵەیەکی گەورەی کرد بە هۆیەوە کارەکەی لەدەست دا.

## وشەکانی moreover, furthermore, in addition:

ئەو وشانەی سەرەوە لە کوردیدا بەمانای (سەرەرای ئەوە، وێڕای ئەوە، جگە لەوە) بەکار دەهێنرێن، ئەم وشانە زیاتر بۆ تەکیدکردن لەسەر شتێك لەنێوان ڕستەکاندا بەکار دەهێنرێن.

He said he had not discussed the matter with her, furthermore he had not even contacted her.

ئەو وتی ئەو مەزوعەم لەگەڵدا باس نەکردووە سەرەڕای ئەوە هەر پەیوەندیشم لەگەڵدا نەگرتوە.

*دەتوانین لەجێگای furthermore هەرکام لەو وشانەی سەرەوە بەکار بهێنین.

## وشەکانی as a matter of fact, in fact:

ئەو دوو وشەیە کە مانای (بەراستی، لە ڕاستیدا، ڕاستت بوێ) دەدەن دەتوانین لەو ڕستەی سەرەوەدا لەجێگای furthermore یان وشەکانی دیکە بیان نووسین. وەك:

He said he had not discussed the matter with her, as a matter of fact; he had not even contacted her.

وتی ئەو مەوزوعەم لەگەڵدا باس نەکردووە ڕاستت بوێ هەر پەیوەندیم لەگەڵدا نەگرتووە.

*دەتوانین لەو ڕستانەدا لەجێگای ئەو وشانە لە and کە بەمانای (... وە ...) لە کوردیدا دێت کەڵك وەربگرین کە مانای ڕستەکە دەبێتە:

وتی ئەو مەوزوعەم لەگەڵدا باس نەکردووەو هەر پەیوەندیم لەگەڵدا نەگرتووە.

## (( وشـــەکـــانـــی on the other hand, nevertheless, in spite of that, however ))

ئەو وشانانەی سەرەوە مانای (هەرچەند، بەو حاڵە، بەم بۆنەوە) دەدەن و دوو ڕستەی جیاواز یان دژی یەك پێکەوە پەیوەند دەدەن.

There is a little chance that we will succeed in changing the law; nevertheless it's important that we try.

تۆزێك بەخت هەیە کە یاساکە بگۆڕین هەرچەند گرینگە کە تێبکۆشین (بەو حاڵەش گرینگە تێبکۆشین).

لەو ڕستەی سەرەوەدا دەتوانین وشەکانی دیکەش لەجێگای nevertheless دابنێین.

*لەو جۆرە ڕستەی سەرەوەدا دەتوانین لە وشەی but کە بەمانای (بەلام)ە کەلك وەرگرین و هەروەها لە وشەکانی (yet, still) کە مانای هێشتا دەدەن کەلك وەرگرین.

The weather was cold and wet, but, we had a good time.

هەوا ساردو وشك بوو، بەلام ئێمە کاتێکی خۆشمان بەسەر برد.

## شێوەی بەکارهێنانی

## although, even though, though, how ever:

ئەم وشانە کە مانای هەرچەند دەدەن لە ڕستەدا بەو شێوانەی خوارەوە بەکار دەهێنرێن.

وشەی though زیاتر لە قسەکردن دا بەکار دەهێنرێ تا نووسین.

وشەکانی though, even though, although لە سەرەتای ڕستەوە بەو شێوەیە بەکار دەهێنرێن.

*although (though/even though) every one played well, we lost the game.*

*We lost the game although (though/ even though) every one played well.*

هەرچەند هەموومان باش یاریمان کرد کێبەرکێیەکەمان دۆڕاند.

هەرچەند کێبەرکێیەکەمان دۆڕاند هەموومان باش یاریمان کرد. (مەبەست لە یاریزانەکانە)

وشەکانی though, although, however دەتوانین لەجێگای but بەکار بێنین بەلام دەبێ سەرنج بدەینە شوێنی بەکارهێنانیان لە ڕستەدا.

وەکوو:

Every one played well, <u>however</u> we still lost the game.

Every one played well we still lost the game, <u>however</u>.

هەمووی باش یاریمان کرد بەلام بەو حالەش دۆڕاین.

Every one played well, <u>though(although)</u> we still lost the game.

Every one played well we still lost the game, though.

ئەو ڕستانە هەر ئەو مانایەی سەرەوەیان هەیە.

## شێوەی بەکارهێنانی
## because, because of, despite, in spite of :

شێوەی بەکارهێنانی ئەم وشانە لە ڕستەکاندا بەو جۆرەیە:

***Because***: ئەم وشەیە بۆ دەرخستنی هۆکاری ئەنجام دان یان ئەنجام نەدانی کارێک بەکار دەهێنرێ. وەك:

Just because I complain, people think I'm a selfish man.

خەڵك وا بیر دەکەنەوە من پیاوێکی خۆ بەزل زانم تەنیا لەبەرئەوەی ڕەخنە دەگرم.

I did it because she told me to. چونکە ئەو پێی وتم ئەنجامم دا.(کارەکەم کرد)

*هەروەك دەبینرێ لەدوای because چ لە سەرەتاداو چ لە نێوەراستدا ڕستەی تەواو بەکار دەهێنرێ.

***Because of:*** بەدوای ئەم وشەیەدا لەناو یان ناوی هاورێ لەگەڵ ئاوەڵناو کەڵك وەردەگرین. وەك:

Because of his wife's being there I said nothing about it.

بەهۆی بوونی خێزانیەوە لەوێ من هیچ شتێکم لەو بارەوە نەوت.

## :in spite of, despite شێوەی بەکارهێنانی

ئەم دوو وشەیە هەرکات بەکار بهێنرێن بە دوایاندا لەناو یان ناوێك کە ئاوەڵناوی لەگەڵدا هاتووە کەڵك وەردەگیرێو یان فرمانی ing دار بەکار دەهێنین. وەك:

Despite applying for hundreds of jobs, he is still out of work.

سەرەرای داخوازی بۆ سەدان کار هێشتا بێکارە.

He is very understanding in spite of his age..

سەرەڕای ئەوە تەمەنی کەمە زۆر تێگەیشتووە

وشەکانی (despite the fact that, in spite of the fact that) لەجێگای ئەو وشانەی سەروە بەکار دەهێنرێن بەڵام بە دوایاندا دەبێ ڕستەی تەواو بێت.

He is still out of work despite the fact that he was applying for hundreds of jobs.

سەرەرای داخوازی بۆ سەدان کار هێشتا بێکارە.

He is too young in spite of the fact that he is very understanding .

سەرەڕای داخوازی بۆ سەدان کار هێشتا بێکارە.

## ڕستە مەرجییەکان Condition Sentences:

هەرکات بەڕێوەچوونی کارێك پەیوەندی بە ئەنجام دانیو یان ئەنجام نەدانی کارێکەوە هەبێو یان بە پێچەوانەوە بەڕێوەنەچوونی کارێك پەیوەندی بە ئەنجام گەیشتن یان نەگەیشتنی کارێکەوە هەبێ لە ڕستە مەرجییەکان کەڵك وەردەگرین.

هەر ڕستەیەکی مەرجی پێك دێ لە دوو بەش کە بریتین لە : *Main clause, If clause*

ڕستە مەرجییەکان بە سێ جۆر دابەش دەکرێن کە بریتین لە :

**١-ڕستەی مەرجی ئەگەر یان داهاتوو (future) probable condition:**

ئەم جۆرە ڕستە مەرجییە هەندێك جار real condition ی پێدەوترێ بۆ داهاتوو بەکار دەهێنرێو ئەگەری بەڕێوەچوونی مەرجەکە زۆرە.

بۆ دروست کردنی ئەم جۆرە ڕستەیە بەشی if clause دەمی ئێستای سادەیەو بەشی main clause دەمی داهاتووی سادەیە.

If you study this book, you will learn English.

If clause main clause

ئەگەر ئەم کتێبە بخوێنن فێری ئینگلیزی دەبن.

*هەروەك لەو ڕستەی سەرەوەدا هاتووە ئەگەری بەڕێوەچوونی مەرجەکە زۆرە.(بە مەرجی کتێبەکە بخوێنین)

*دەتوانین لەم جۆرە ڕستانەدا لە فرمانە یاریدەدەرەکان لە بەشی main clause دا کەڵك وەرگرین. وەکوو:

If you study this book, you can learn English.

ئەگەر ئەم کتێبە بخوێنن دەتوانن ئینگلیزی فێر بن.

وە یان دەتوانین بەشی main clause بەشێوەی فرماندان بەیان بکەین.

If you went to learn English, study this book.

ئەگەر دەتەوێ فێری ئینگلیزی بیت ئەم کتێبە بخوێنە.

مەرجی بەڕێوەنەچوونی کار لەم جۆرە ڕستەیەدا بەو شێوەیە بەیان دەکرێ.

If the weather isn't warm, we won't go to picnic.

ئەگەر هەوا گەرم نیە ئێمە ناچین بۆ سەیران.

*لەم شێوەیەدا دەتوانین لە وشەی unless کەڵك وەرگرین کە فرمانی ڕستەکە لە بەشی if clause ناکاتە negative.

Unless the weather is warm, we won't go to picnic.

ئێمە ناچین بۆ سەیران مەگەر ئەوەی هەوا گەرم بێ.

دەتوانین جێگای if clause لەگەڵ main cluse بگۆڕین.

We will stay home if we don't go to the movies.

ئەگەر نەڕۆین بۆ سینەما لە ماڵەوە دەمێنینەوە.

Where will we go if he comes here?

ئەگەر ئەو بێت بۆ ئێرە بۆ کوێ دەچین؟

**٢-ڕستەی مەرجی نائیحتیمال Unreal Condition:**

ئەم جۆرە ڕستەیە بۆ بەیانی کارێك کەڵکی لێوەردەگیرێ کە ئەگەری ئەنجام دانی if clause نەبێت.

بۆ دروست کردنی ئەم جۆرە ڕستانە دەبێ if clause ڕابردووی سادەو بەشی main clause داهاتوو لە ڕابردوودا بێت.

If I had more money, I would buy a car.

ئەگەر پارەی زۆرترم ببوایە ئوتومبیلێکم دەکڕی.

If she knew the answer, she would tell us.

ئەگەر ئەو وڵامەکەی بزانیایە بە ئێمەی دەگوت.

هەروەك لەو ڕستانەدا دەبینرێ بەپێی بەشی if clause کەیانو بەو شێوەی کە دردەکەوێ ئاماژە بە ڕابردوو دەکات بەڵام لە ڕاستیداو لە ناوەڕۆك دا ئاماژەیە بۆ ئێستایە نەك ڕابردوو.

هەروەك لە ڕستەی یەکەم دا هاتووە دەڵێ (ئەگەر پارەی زۆرترم ببوایە ئوتومبیلێکم دەکڕی) مەبەستی ئەوەیە کە ئێستا پارەی تەواوی نیە کە ئوتومبیلە کە بکڕێ کەوابوو ئاماژە بە ڕابردوو ناکات.و هەروەها لە ڕستەی دووەم دا (ئەگەر وەڵامەکەی بزانیایە بە ئێمەی دەکوت) ئاماژە بەوە دەکات کە ئێستا وڵامەکە نازانیو هیچ پەیوەندییەکی بە ڕابردووەوە نیە.

***چەند نموونەیەکیتر*** :

Which countries would you go to if you travelled?

ئەگەر سەرفەرت بکردایە بۆ کام وڵاتانە دەچووی؟

Unless I had a lot of money, I wouldn't travel.

من سەفەرم نەدەکرد مەگەر ئەوەی پاریەکی زۆرم ببوایە.

If he <u>*were*</u> clever, he would know he was making a mistake.

ئەگەر زیرەك بوایە دەیزانی هەڵەیەکی کردووە.

*هەروەك دەبینرێ لەم شێوازەدا لەجێگای were, was بەکار دەهێنرێ.

*جیاوازی ڕستەکانی مەرجی جۆری یەکەمو دووەم لەگەڵ یەك: سەرنج بدەنە ئەو نموونانەی خوارەوە:

If I win the tennis match, I will be happy. (I think I have a good chance)

ئەگەر من لە کێبەرکێی تێنسەکە سەرکەوتوو بم دڵخۆش دەبم. (وا بیر دەکەمەوە کە بەختێکی باشم هەیە بۆ سەرکەوتن)

If I won a thousand pounds, I would buy apartment.(but, I don't think I will)

ئەگەر هەزار پۆندم ببردایەتەوە ئاپارتمانێکم دەکڕی.(بەڵام لەو باوەڕەدا نیم بیبەمەوە)

*هەروەك لە ڕستەی سەرەوەدا دەبینرێ ئیمکانی بە ئەنجام گەیشتن کاردکە هەیە، بکەرەکە خۆش بینە کە سەرکەوێ بەڵام لە ڕستەی دووەم دا تەنیا وەك ئاواتێك باس لە شتەکە دەکرێو بکەر لەسەر ئەو باوەڕە نیە ئەو پارەیە بەریتەوە.

**٣-مەرجی مەحاڵ Impossible Condition:**

ئەم جۆرە ڕستانە کە لە ئینگلیزیدا دەتوانین بە (Unreal Condition Past) ناویان بەرین. لەم دۆخەدا کارەکە تەنیا لە ڕابردوودا ئیمکانی بەڕێوەچوونی هەبووەو ئەویش بە ئەنجام گەیشتوەو تەنیا وەك خەیاڵێك باس دەکرێ. بۆ دروست کردنی ئەم جۆرە ڕستانە بەشی If clause ڕابردووی دوورە و بەشی main clause داهاتووی تەواو لە ڕابردوودایە. وەك:

If I had spoken to her, I would have told her the truth.

ئەگەر قسەم لەگەڵ کردبایە ڕاستیەکەم پێدەگوت.

If the weather had been cold, I couldn't have gone to the picnic.

ئەگەر هەوا سارد بوایە من نەمدەتوانی بچم بۆ سەیران .

*هەروەك دەبینرێ لەو ڕستانەی سەرەوەدا مەرجەکە باسی ڕابردوو دەکاتو بە ئەنجام گەیشتنی کارەکەیش پێوەندی بە ڕابردووەوە هەیە لە ڕستەی یەکەم دا کە دەڵێ (ئەگەر قسەم لەگەڵ کردبایە ڕاستیەکەم پێگوتبوو) لێرەدا دەردەکەوێ کە قسەی لەگەڵ نەکردووە (پێوتی ڕاستیەکە) وەك بیرکردنەوەیەك یان خەونو خەیاڵێك دێتە بەرباسو لە ڕستەی دووەم دا کە دەڵێ (ئەگەر هەوا سارد بوایە من نەمدەتوانی بچم بۆ سەیران ) لێرەیش دادەردەکەوێ کە مەرجەکە هەوا خۆش بوون بوود کە بەشی دووەمەکەی کە (چوون بۆ سەیران)ە هاتۆتە دی.

**هێندێك خاڵی گرینگ له دروست كردنی رسته مه‌رجی‌یه‌كان دا :**

وشه‌ی or else كه به مانای if not به‌و شێوه‌ی خواره‌وه به‌كار ده‌هێنرێ.

Hurry up or else you'll be late. زووكه ئه‌گه‌ر ناته‌وێ بكه‌ویته دره‌نگ.

Hurry up if you don't you'll be late.

***Otherwise***: ده‌توانین له‌م وشه‌یه به‌و شێوه‌یه كه‌ڵك وه‌رگرین. هه‌ركات رسته ئاماژه به ئێستا بكات ده‌بێ له wouldو چاوگی بێ to كه‌ڵك وه‌رگرین هه‌ركات رابردوو بێت. (ناوی كارلێكراو + would + have) به‌كار ده‌هێنرێن. وه‌ك:

I don't have money otherwise, I would buy a house.

من پاره‌م نیه ئه‌گینا ماڵێكم ده‌كڕی.

I didn't have house otherwise, I would have gotten married.

من ماڵم نه‌بوو ئه‌گینا ژیانی هاوبه‌شم پێك ده‌هێنا. (هێنابوو)

***On condition that:*** له‌م وشه‌یه به‌و شێوه‌ی خواره‌وه كه‌ڵك وه‌رده‌گرین.

They agreed to lend us the car on condition that we returned it after a month.

ئه‌وان رازی بوون ئوتومبیله‌كه‌مان بده‌نێ به‌مه‌رجێك دوای مانگێك بینێرینه‌وه.

***If only***: هه‌ركات ئه‌م وشه‌یه له رسته‌دا به‌كار بهێنرێ ئاواته‌خوازی به‌رێوه‌چوونی كارێكه. ئه‌م وشه‌یه به‌و سێ شێوه‌ی خواره‌وه به‌كار ده‌هێنرێ.

**١-به‌دوای‌دا ده‌می ئێستای ساده به‌كار ده‌هێنرێ‌و ئاماژه به داهاتوو ده‌كات. وه‌ك:**

If only he comes here on time. هیوادارم به‌كات (له‌سه‌ر كات دا) لێره بێت.

**٢-به‌دوای‌دا رابردووی ساده یان رابردووی دوور به‌كار ده‌هێنرێ‌و نیشانی ده‌دات كه كارێك له رابردوودا به ئه‌نجام گه‌یشتوه یان به پێچه‌وانه به ئه‌نجام نه‌گیشتوه بۆیه به داخه‌وه یادی لێ‌ده‌كاته‌وه. وه‌كوو:**

if only I knew her name (he has seen a girl again).

خۆزگه ناوه‌كه‌یم ده‌زانی (پێشتر كچێكی دیوه ئاماژه به ناوی ئه‌و ده‌كات)

If only he hadn't been rich. خۆزگه ئه‌و ده‌وڵه‌مه‌ند نه‌ده‌بوو.

**٣-به‌دوای‌دا وشه‌ی would به‌كارده‌هێنرێ‌و ئاماژه به داهاتوو ده‌كات. وه‌ك:-**

If only he would remember to send that letter.

خۆزگه له بیری ده‌بوو ئه‌و نامه‌یه‌ی ده‌نارد.

***Should***: لەم وشەیەش بەو شێوەی خوارەوە کەڵك وەردەگرین.

If I should go to England, I would learn English very well.

ئەگە هاتوو چووم بۆ ئینگلیز، ئینگلیزی زۆر باش فێر دەبم.

*ئەو ڕستەیەی سەرەوە بە جۆرێك لە ڕستە مەرجی‌یەکان ناو دەبرێ و بۆ دروست کردنی لــە بەشــی if clause دەبــێ should بــەکار بێــنینو لــە بەشــی main clause دا دەبــێ wouldو چاوگی بێ to بەکار بهێنرێ. بۆ داهاتوو بەکار دەبرێو ئەگەری بەرێوەچوونی کارەکە کەمە.

هەروەك لەو ڕستەیەی سەرەوەدا هاتووە دەڵــێ (ئەگەر هــاتوو (پــێش هــات) چــووم بــۆ ئینگلیز، ئینگلیزی زۆر بە باشی فێر دەبم.) لێرەدا دەردەکەوێ کە دڵنیــا نیــە بــە چــوونی بــۆ ئینگلیز بەڵام هیواداره کە بچێ.

لەو ڕستانەدا دەتوانین if لابــەرینو( should )ە کــە لــە جێگــایدا دابنــێین بێ‌ئــەوەی ئاڵوگۆڕێك لەمانای ڕستەکەدا پێك بێت.

Should I go to England, I would learn English very well.

لەم ڕستانەدا دەتوانین لە بەشی main clause دا لە فرمانە یاریــدەدەرەکانی could, might کەڵك وەرگرین. نموونە:

Should I go to England, I could learn English very well.

ئەگەر پێش هات چووم بۆ ئینگلیز دەتوانم زۆر بە باشی فێری ئینگلیزی ببم.

*دەتوانین لە ڕستە فرماندەرەکانیش کەڵك وەرگرین. وەك:

If he should come here, send him my home.

ئەگەر هاتوو هات بینێرە بۆ ماڵەکەم.

*جۆرێك ڕستەی مەرجی دیکە هەیە کە هەردوو بەشەکەی دەمی ئێستای سادەیە. ئەم جۆرە ڕستانە لە کاتێك دا بەکار دەهێنرێن کە باس لە کارێك دەکەن کــە ڕاســتەقینەیەو هیچ ئاڵوگۆڕێکی تێدا پێك نایەت. وەکوو:

If you heat snow, it melts. ئەگەر بەفر گەرم کەیت دەتوێتەوە.

***سەرنــج:***

لە ڕستە مەرجی‌یەکانی جۆری سێهەم دا دەتوانین had لــەجێگای if دانــێین بێ‌ئــەوەی ماناکە بگۆڕێ. وەك:

Had I spoken to her, I would have told her the truth.

ئەگەر بمدیبایە ڕاستیەکەم پێ دەگوت.

## چۆنیەتی بەکارهێنانی wish:

ئەم وشەیە هیوا و ئاوات بەرانبەر بە بەڕێوەچوونی کارەکان دەردەخات کە بۆ هەر سێ ..مەکانی (ئێستا، رابردوو، داهاتوو) بە کار دەهێنرێ.

**١-ئاواتەخوازی بۆ ئێستا (دەمی رانەبردوو):** لەم دۆخەدا فرمانی دوای wish دەمی ..ابردووە بەلاّم مانای رستەکە هێما بە ئێستا دەکات. وەك:

I wish I worked only three days a week.

خۆزگە من لە حەوتوودا تەنیا سێ رۆژ کارم دەکرد

***لەم رستانەدا was کە بۆ کەسی یەکەم و سێیەمی تاك بەکار دەهێنرێ ..ەبێتە were. وەك:**

I wish he were here tonight. خۆزگە ئەمشەو لێرە بوایە.

**٢-ئاواتەخوازی بۆ رابردوو:** لەم دۆخەدا فرمانی دوای wish دەمی رابردووی ...ە. وەك:

I wish he had spoken to me last week.

خۆزگە حەوتووی رابردوو قسەی لەگەڵم بکردایە.

**٣-ئاواتەخوازی بۆ داهاتوو:** لەم دۆخەدا لەدوای wish لە فرمانی یاریدەدەری would کەڵك وەردەگرین.

I wish you wouldn't leave your clothes all over the floor.

هیوادارم جلوبەرگەکانت لەسەر (هەموو) عەرزەکە بەجێ نەهێڵێ.

*دەتوانین لە wish بەو شێوەی خوارەوەیش کەڵك وەرگرین کە پیشاندەری ..ئاوازییەکی زۆرە بەرانبەر بە شتێك. وەك:

I wish to learn several languages. زۆرم پێخۆشە چەند زمان فێر بم.

*دەتوانین wish بۆ ئاواتەخوازی خەڵکانیتر بەکار بێنین. وەك:

He wished we have a good time.

ئەو هیوادار بوو ئێمە کاتێکی خۆش بەسەر بەرین.

## شێوەی بەکارهێنانی had better – would rather:

***would rather***: ئەم (ئایدیۆم)ە لە ئینگلیزیدا بەو شێوانە بەکار دەهێنرێ.

**١)لە دەمی داهاتوو یان ئێستادا: لەم دۆخەدا بەدوایدا لە چاوگی بێ to کەڵك وەردەگرین. وەك:**

He would rather die than give money.

ئەو پێی خۆشە بمرێ تا ئەوەی پارە بدات.

Do you mind if I smoke? ئایا گرفتێك نیە ئەگەر جگەرە بكێشم ؟

I would rather you don't . من پێم باشە نەكێشی.

*هەروەك دەبینری لە رستەی یەكەم دا فرمانی دوای than وەك فرمانی دوای would rather چاوگی بێ (to)ە.

**٢)لە دەمی رابردوودا: لەم دۆخەدا بەدوایدا (ناوی كارلێكراو + have) بەكار دەهێنری. وەك:**

I would rather have stayed at home than gone there.

وام پێباش بوو لە ماڵەوە بمێنمەوە تا بچم بۆ ئەوی.

*هەروەك لەم رستەیەش دا دەبینری فرمانی دوای than بەشێوەی ناوی كارلێكراو بەكارهێنراوە.

**دەتوانین لەم جۆرە رستانەدا لە وشەی would sooner یش كەڵك وەرگرین.

وشەی would rather لەگەڵ prefer هاومانایەو دەتوانین ئەویش بەكار بێنین. وەك:

I would rather buy a new shirt.

من وام پێباشە كراسێكی نوێ بكرم. I prefer to buy a new shirt.

دەتوانین بەدوای prefer لە فرمانی ing داریش كەڵك وەربگرین. وەك:

I prefer playing football to watching it.

من وام پێباشە یاری فوتباڵ (تۆپێپێ) بكەم تا ئەوەی چاوی لێبكەم.

*هەروەك دەبینری فرمانی دوای to یش بەشێوەی ing دار هاتووە كە پەیڕەوی لە یاسای فرمانی پێش خۆی دەكات.

***__Had better__***: ئەم ئایدیۆمە لە زمانی ئینگلیزیدا بەو شێوازانەی خوارەوە بەكار دەهێنری.

**١)ئاماژە بە ئێستاو داهاتوو دەكات: لەم دۆخەدا هەموو كات چاوگی بێ to بە دوایدا بەكار دەهێنری. وەك:**

You had better go next to the doctor a bout your cough.

چاكترە بۆ ئەو كۆخەیەت بچیتە لای پزیشك.

**٢)ئاماژە بە رابردوو دەكات: لەم دۆخەدا بەدوایدا لەم یاسایە كەڵك وەردەگرین (ناوی كارلێكراو + have). وەك:**

You had better have stayed at home last night.

چاكتر دەبوو دوێنێ شەو لە ماڵێ بمایەتەوە.

## *جیاوازی had better, would rather:

بۆ دیاریکردنی جیاوازی ئەم دوو ئایدیۆمە بڕواننە ئەو نموونانەی خوارێ.

I would rather have stayed at home last night.

وام پێباش بوو دوێنێ شەو لە ماڵێ بمێنمەوە.

I had better have stayed at home last night.

چاکتر بوو دوێنێ شەو لە ماڵێ بمایەتەوە.

*لە رستەی یەکەم دا دەردەکەوێ بکەر ئەوەی پێباش بووە ئەنجامی داوە یانی لە ماڵەوە ماوەتەوە بەڵام لە رستەی دووەم دا بە پێچەوانە بکەر لە ماڵێ نەماوەتەوەو بەهەر ...یەك ئێستا لە چوونەدەرەوەی دوێشەو پەشیمانە.

## *ئایدیۆمی to be supposed to:*

ئەم ئایدیۆم یان زاراوە یەکێك لە ئایدیۆمە گرینگەکانی زمانی ئینگلیزییە ...لە دەمەکانی ئێستاو رابردوودا بەکار دەهێنرێو لە ماناداوەك فرمانەکانی to be expected to, to be due to بەکار دەهێنرێ کە بە مانای (وا بڕیارە).

...وەك:

He is supposed to give me his book. وا بڕیارە کتێبەکەی بە من بدات.

They are supposed to come on time. وا بڕیارە لەسەر کات دا بێن.

The engine doesn't sound like it's supposed to.

ماتۆڕەکە (مەکینەکە) وەك ئەوەی بڕیارە دەنگی نیە. (هەروەك ئەوەی بڕیار بوو دەنگی نەبێ ...ی نایە)

You were supposed to be here an hour ago.

وا بڕیار بوو سەعاتێك لەوەپێش لێرە بیت.

How was I supposed to know you were waiting for me?

چۆن دەبوو کە بزانم تۆ چاوەڕێی من بووی؟

*وشەی supposed بەرانبەرە لەگەڵ فرمانەکانی to imagine, to think بە مانای ...ردنەوە) کە بەو شێوەی خوارەوە بەکار دەهێنرێ.

I supposed that you weren't here.

وا بیرم دەکردەوە کە تۆ لێرە نەبووی.

## زێدەواژە Preposition:

زێدەواژە کە لەپێش ناوەکانو جێناوەکان بەکار دەهێنرێ تا پەیوەندیان بکات بە بەشەکانی دیکەوە. بەشێکی گرینگ لە ڕیزمانی ئینگلیزیی‌یە کە لەوانەیە زیاتر لە بەشەکانی تر گرفت بۆ فێرخوازانی ئەو زمانە ساز بکات.

زێدەواژەکان لە ئینگلیزیدا زۆرنو شێوەی بەکارهێنانیان ئالۆزو جۆراوجۆرە کە لێرەدا هێما بە چۆنیەتی بەکارهێنانی گرینگترینی ئەوان دەکەین کە بریتین لە:

*in, on, at, of, off, by, after, before, up, down, through, during, against, behind, in front of, under, over, a above, below, from, besides, beside, near, beneath, opposite, across, about, within, without, to, inside, outside ,till ,until ,between, among.*

**لێرەدا شێوەی بەکارهێنانیان لە ڕستەداو ئەو شوێنانەی تێدا بەکار دەهێنرێن باس دەکەین.**

**١-*in* بۆ کاتەکان: لەپێش (مانگ، وەرز، ساڵ، سەدە) بەکار دەهێنرێ. وەك:**

in march – in 2002 – in spring – in the 20th century

*لەپێش بەشەکانی ڕۆژو شەوەوە هەرکات بە مانایەکی گشتی بەکار بهێنرێن. وەك:

in the morning – in the evening – in the night

*بەڵام هەرکات لەپێش ئەو وشانەدا ئاوەڵفرمانی کات بەکار بهێنرێ لە in کەڵك وەرناگرین. وەك:

tomorrow morning – last night – yesterday afternoon

*هەرکات لە ڕستەیەکی دەمی داهاتوودا لەپێش ماوەی کات in بەکار بهێنرێ بەمانای (هەتا)یە.

I will go to London in another week. هەتا حەوتوویەکی‌تر دەچم بۆ لەندەن.

بۆ بەکارهێنانی لە شوێن دا بەو شێوانە بەکار دەهێنرێ. وەك:

**- لەپێش ئەو شتانەوە کە جێدەگرن:**

The book is in that drawer. کتێبەکە لەنێو ئەو چەکمەجە(کەشێو) دایە.

Leave the key in the lock. هاچەرەکە (کلیلەکە) لەناو قوفڵەکەدا بەجێبێڵە.

**_لەپێش شارو وڵاتو کشوەر (قارە) پارێزگاکان دا:** وەك:

I live in Kurdistan. من لە کوردستان دەژیم.

A country in Africa. وڵاتێك لە ئەفریقا.

**_لەپێش ئەو شوێنانەی مرۆڤ لەناویاندا دەبێ . وەك:**

She was lying in bed. ئەو لە جێگادا راکشابوو.

He got in her car. ئەو سواری ئوتومبیلەکەی بوو.

**_لەپێش هێندێك ناوەوە کە شتێك لە خۆیان دەگرن. وەك:**

He dipped his brush in the paint. ئەو فڵچەکەی لە رەنگەکە وەردا.

Soak your dress in cold water. کراسەکەت لە ئاوی ساردا تەڕکە.

**_بۆ پیشاندانی هەموو یان بەشێك لە شتێك یا کەسێك. وەك:**

There are 31 days in may. مانگی مەی ٣١ رۆژە .

I recognize his father in him.

من باوکی تێدا بەدی دەکەم. (وەك باوکی هەڵسوکەوت دەکات) یـان (هـەموو شـتێکی وەك

ا، لی وایە)

**_بۆ ئەو لیباس (جل وبەرگ)انەی لەبەر دایە. وەك:**

Dressed in their best clothes.

کراسەکەی بەریان چاکترین قوماشە.(پارچەیە).

she was all in black. ئەو رەشی پۆشیبوو (هەموو جل وبەرگەکانی رەش بوو)

*بۆ بەیان کردنی ئەو حاڵەتە سروشتییانە کـە شـتێك یـان کەسـێکیان لـەخۆ گرتبـێ.

، ما:

We went out in the rain. ئێمە لە باران دا چووینە دەرێ.

He was sitting alone in the darkness. ئەو بە تەنیا لە تاریکی دانیشتبوو.

**_بۆ نیشاندانی حاڵەتی دەروونی. وەك:**

I fell in love with Kale. من ئەویندار (عاشق)ی کالێ بووم.

**_بۆ چوونە ناو شوێنێکەوە. وەك:**

She opened the door and went in. ئەو دەرگاکەی کردەوە و چووە ژوورێ.

هەروەها دەتوانی لە in لەو شوێنانەی خوارەوە کەڵك وەرگرین.

I can't drink coffee with milk in.

ناتوانم قاوەیەك بخۆم کە شیری تێدا بێت.

- هەروەها بۆ پلەکانی وەرزش بەکار دەهێنرێ. وەك:

Brazilian were in first. برازیلیەکان بوون بە یەکەم.

٢) **_on_: لەپێش ڕۆژەکانی حەوتووو مانگ بەکار دەهێنرێ. وەک:**

I comes here on Friday. من ڕۆژی هەینی دێم بۆ ئێرە.

He was born on the tenth of march. ئەو لە دەی مارس دا لە دایك بووە.

_بە مانای لەسەر بەکار دەهێنرێ بەو شێوەی خوارەوە.

A picture on a wall. وێنەیەك لەسەر دیوارێك.

Put it down on the table. لەسەر کورسی‌یەکە داینێ.

**_بۆ خۆڕاگرتن لەسەر شوێنێکی جەستەی مرۆڤ یان شتێك. وەك:**

She was standing on one foot. ئەو بەسەر لاقێکەوە ڕاوەستابوو.

Try lying on your back. لەسەر پشت خەوتن تاقی بکەوە.

Hang your coat on the hook. کۆتەکەت بەو لیباس گیرەیەدا هەڵواسە.

**_بۆ ڕۆیشتن بەلاق‌و سواری ئەسپ‌و پاسکیل (دوچرخە) وەك:**

I came on my bike. من بە پاسکیلەکەم هاتم.

A man on horseback. پیاوێك بەسەر ئەسپەوە.

**هەروەها بۆ کاتی سەفەر بۆناو سەیارە و تەیارەو کەشتی .... هتد. وەك:**

She was on the plane from New York. ئەو لە تەیارەی نیۆیۆرك دا بوو.

**_بۆ دەبڕینی خێرایی کارێك. وەك:**

On arriving home I discovered they had gone.

بە گەیشتنە ماڵێم تێ‌گەیشتم کە ڕۆیشتبوون.

**_بۆ ئەو شتانەی خوارەوە کەڵکی لێ‌وەردەگیرێ. وەك:**

If you like a good story, read on.

ئەگەر چیرۆکی باشت پێ‌خۆشە بیخوێنەوە.

She stopped for a moment, then walked on.

ئەو بۆ ساتێك ڕاوەستاو و پاشان ڕۆیشتەوە

**_بۆ لەبەرکردنی چاویلکەو جل‌وبەرگ. وەك:**

what did she wear on? ئەو چی لەبەر کرد؟

I didn't wear my glasses on. من چاویلکەکەم لەچاو نەکرد.

*بۆ قسەکردن بە تەلیفۆن و لێدانی ئامرازی مۆسیقاکان بەکار دەهێنرێ و هەروەها بۆ بەرنامەکانی کامپیوتێر و ئینترنێت کەڵکی لێوەردەگیرێ بەو شێوانەی لەو نموونانەدا هاتوون. وەک:

He played a tune on her guitar. بەگیتارەکەی ئاهەنگێکی لێدا.

The information is available on the internet.

زانیاریەکان لە ئینترنێت دا بەکەڵکن.

What is on TV? تەلەفیزیۆن چی هەیە؟

We spoke on the phone. ئێمە بە تەلیفۆن قسەمان کرد.

_بۆ هەڵکردنی شتە کارەباییەکان. وەک:

The TV is always on in their house.

تەلەفزیۆنەکە هەموو کات لە ماڵی ئەوان دا هەڵکراوە.

The lights were all on. هەموو چراکان هەڵکرابوون.

_بۆ ئەو بەرنامانەی کە بەڕێوە دەچن. وەک:

The game is still on. یاریەکە هێشتا بەردەوامە.

I don't think we have got anything on this weekend.

پێم وانیە ئێمە هیچ بەرنامەیەکمان هەبێ بۆ پشووی ئەم حەوتووە.

_بۆ بوون لەسەر ئیش و کار: وەک:

I am on now till 8 tomorrow morning.

من لە ئێستاوە هەتا سەعات ٨ی سبەینێ بەیانی لێرەم.

**خاڵێکی گرینگ:**

هەردوو زێدەواژەی in و on بەدوایان دا وشەی time بەکار دەهێنرێ کە بە مانای (لەسەر کات یان بەکات) بەکار دەهێنرێن، کە جیاوازیەکیان لە نێواندا هەیە.

***On time***: بەمانای رێك لەسەر کات دا بەکار دەهێنرێ بەڵام in time بە مانای (لە) وەخت یان بە کات بەکار دەهێنرێ بەڵام ئەگەر چەند خولەکێك پێش یان پاش زۆر گرینگ (نی)ە بەتایبەت لەپێش کاتدا بێت. وەك:

Please come there in time. تکایە لەسەر کاتدا بچۆ بۆ ئەوێ.

Please come there on time. تکایە رێك لەسەر کاتدا بچۆ بۆ ئەوێ.

٣-***at***: لەپێش خولەك و کاتژمێردا بەکار دەهێنرێ. وەك:

He came here at ten minutes to five.

ئەو دە خولەك بۆ پێنج هات بۆ ئێرە. ( دە دەقیقە بۆ پێنج)

**_لەپێش ئەو کاتانەی شەوو ڕۆژدا. وەک:**

sunset, sunrise, midday, mid night, night, noon, dawn

_لەپێش عینوان (ئادرەس)ە تەواوەکاندا. وەك:

I live at 1203 Washington street.

من لە شەقامی ١٢٠٣ی واشنگتۆن ژیان دەکەم.

_بۆ بەیان کردنی ئەوەی کەسێك یان شتێك لە کوێیە. وەك:

At the corner of the street. لە قەراغی شەقامەکەدا.

I met her at the hospital. لە نەخۆشخانە دیتم. (دیم)

**_بۆ باس کردنی کاتی ڕووداوەکان. وەک:**

At the end of the week. لەکۆتایی حەوتوودەکەدا.

I didn't remember at the time of writing.

من لەکاتی نووسین دا لەبیرم نەبوو.

**_بۆ بەیان کردنی ئەو کاتانەی تەمەن کە مرۆڤ کارێکی تێدا ئەنجام داوە.**

She got married at 25. ئەو لە بیستو پێنجساڵیدا ژیانی هاوبەشی پێك هێنا.

He left school at the age of 16.

ئەو لە تەمەنی شانزدە ساڵیدا قوتابخانەی بەجێ هێشت.

*بەدوای ئەو فرمانانە دێ کە بۆ نیشاندانی کارێك بەکار دەبرێن کە کەسێك دەیهەوێ ئەنجامی بدات، بەڵام زۆرجار بە تەواوی سەرکەوتوو نابێ.

He clutched wildly at the rope.

ئەو بەشێوەیەکی دڕندانە چنگی لە تەنافەکە گیر کرد.

She nibbled at a sandwich. ( ate only small bit of it)

ئەو گازی لە ساندویچەکە گرت. (تەنیا تۆزێکی لێ خوارد).

**_بۆ پیشاندانی بارودۆخی کەسێک یان شتێک. وەک:**

The country is now at the war. وڵات ئێستا لە حاڵی شەڕ دایە.

I think Mr. Harris at lunch. پێم وایە بەڕێز هاریس لە نەهارە.

**_بۆ باس کردنی شتێک کە لە چاکی یان خراپی دایە. وەک:**

The garden is at its most beautiful in June.

لە ژوئێن دا باخەکە لە جوانترین کاتی خۆی دایە.

**_بۆ پیشاندانی ئەوەی کەسێک، تا چەند لە شتێک دا سەرکەوتووە. وەک:**

I am good at French. من لە زمانی فەرانسەییدا باشم.

٤-_about_: ئەم وشەیە بەمانای (لەبارەی، بەهۆی، لە نزیك، لە نزیكی، نزیك لە) بەو شێوانەی خوارەوە بەكار دەهێنرێ.

What is she angry about? هۆی چی‌یە ئەو هەمووە زیزە؟

Tell me all a bout it. هەموو شتێكم لەبارەی ئەوەوە پێ‌بڵێ.

We stopped about the town for an hour.

ئێمە بۆماوەی كاتژمێرێك لە نزیك شار راوەستاوین.

She is somewhere about the office. ئەو لە شوێنی نزیكی دایەرەكەیە.

*وشەی about هەركات لەگەڵ how, what بەكار بهێنرێ بەمانای (ئەی ... چۆن) بەو شێوەی ژێرەوە بەكار دەهێنرێن.

How is your father? باوكت چۆنە؟

He is fine. باشە.

What about you? ئەی تۆ چۆنی؟

٥-_across_: بەمانای (لە بەرێكەوە بۆ بەرێكی دیكە، لەوبەر، لە دەوروبەری) بەكار دەهێنرێ. وەك:

He ran across the street. ئەو لەم بەر بۆ ئەو بەری شەقامەكە هەڵات.

There's a restaurant right across the street.

چێشتخانەیەك راست لەوبەری شەقامەكەیە.

٦-_opposite_: ئەم وشەیە بەمانای (بە پێچەوانە، لە بەرانبەری، دژی، دژی‌یەك) بەكار دەهێنرێ. وەك:

I sat opposite him during the meal.

من لەماوەی نان خواردنەكەدا لە بەرانبەری‌دا دانیشتم.

Night and day are opposite. شەوو رۆژ پێچەوانەی یەكن.

٧-_within_: ئەم وشەیە بەو جۆرانەی خوارەوە بەكاری دێنین. وەك:

You must receive a reply within seven days.

تۆ دەبێ لەماوەی حەوت رۆژدا وڵامێك وەرگری.

A house within a mile of the sea.

ماڵێك لەیەك مایلی چۆمەكەوە.

We are now within range of enemy fire.

ئێمە ئێستا لەژێر چاودێری ئاوری دوژمن داین.

٨ _without_: لەم وشەیەش بەو شێوانەی خوارەوە كەڵك وەردەگرین.

They had gone two days without food. دوو ڕۆژ بێخواردن ڕۆیشتبوون.

Don't go out without your coat. بێکۆت نەچیتە دەرێ.

do you see without your glasses? ئایا بێچاویلکەکەت دەبینیت؟

٩-**beneath**: ئەم وشەیە بەمانای (لەژێر، باش نەبوون بۆ کەسێ، بۆ... ناشێ). وەك:

The boat snake beneath the waves.

لۆرکەکە لەژێر شەوپۆلەکاندا نقوم بوو.

He considered jobs aren't beneath him.

ئەو لێکیداوە کە ئەو جۆرە کارانە بۆ ئەو ناشێن. (بۆ ئەو باش نین)

*ناشێ یان ناشی بەمانای (نەشیان، جۆر دەرنەهاتن، ڕێك نەکەوتن لەگەڵ کەسێك یا شتێك) دایە.

١٠-**near**: ئەو وشەیە بەمانای "نزیك، (بۆماوەی نێوان دوو شت) نزیك (بۆ کات) لە دەوری (بۆ پارە، تەمەن) خەریکە. بەکار دەهێنرێ. وەك:

Do you live near here? ئایا تۆ لە نزیکی ئێرە ژیان دەکەی؟ (بۆماوەی شوێن)

My birthday is very near Christmas.

ڕۆژی لەدایکبوونم زۆر لە کریسمەس نزیکە. (بۆماوەی کات)

They have near $5 millionS. ئەوان لە دەروی پێنج ملیۆن دۆلاریان هەیە.

He is near 70. ئەو لە دەوری ٧٠ساڵدایە.

She was near to tears. ئەو خەریك بوو فرمێسك بڕێژێ.

١١-**inside**: ئەم وشەیە بەمانای (ناو یان لەناو) بەکار دەهێنرێ. وەك:

Go inside the house. برۆ ناو ماڵەکەوە.

Inside the box was a gold watch. لەناو قوتوەکە سەعاتێکی زێڕ هەبوو.

١٢-**outside**: ئەو وشەیە پێچەوانەی inside ە بەمانای (دەرەوە، لە دەرەوە) بەکار دەهێنرێ. وەك:

It's snowing outside. لەدەروە بەفر دەبارێ.

١٣-**against** : ئەم وشەیە بەمانای (دژی، بەپێچەوانەی، لە بەرانبەری) بەکار دەهێنرێ. وەك:

The fight against terrorism. شەڕی دژی تیرۆریزم.

Her age is against her face. تەمەنی بەپێچەوانەی سەرو چاوی دیارە.

Put the piano there against the wall. پیانۆکە لەوێ بە دیواردکەوە نێ.

١٤-***during***: ئەم وشەیە بەمانای (لەماوەی، کاتی) بەکار دەهێنرێ. وەك:

During the 1990s. لەماوەی ساڵەکانی نەوەد. (نەوەدەکان)

I only saw her once during my stay in Iran.

تەنیا جارێك لەکاتی مانەوەم لە ئێران دیم.

**١٥-*of*: ئەم وشەیە هەروەك پێشتر باسمان کردوە خاوەندارێتی کەسێك، یا شتێك بەسەر کەسێك یان شتێکی دیکەدا دەردەخاو هەروەها بۆ پیشاندانی پێشینەی ژیانی کەسانێك لە شوێنی. وەك:**

A women of Italian descent. ژنێکی بە رەگەز ئیتالیایی.

The people of India. خەڵکی هیندستان.

**١٦-*off*: ئەم وشەیە بەو شێوانەی خوارەوە بەکار دەهێنرێ. وەك:**

We live off main street. ئێمە لەسەر شەقامی ئەسڵی دەژین.

You need to take the top off the bottle first !

پێویستە لە پێشدا سەری قوتوەکە لابەری.

**١٧-*from*: ئەم وشەیە بەمانای (لە) بەکاردەهێنرێ. وەك:**

Has the train from Paris arrived? ئایا شەمەندەفەرەکەی پاریس گەیشتووە؟

A letter from my brother. نامەیەك لە براکەمەوە.

I'm from Iraq. من ئێراقیم.

**١٨-*by*: ئەم وشەیە یەکێك لەو زێدواژانەیە کە زۆر بەکار دەهێنرێ و شێوازی جۆراوجۆری هەیە لە بەکارهێنان دا.**

*لەپێش ناوی ئوتومبیل و کەشتی و تەیارەو شەمەندەفەر بەکار دەهێنرێ. وەك:

He comes here by bus. ئەو بە پاس دێت بۆ ئێرە.

*هەرکات لەپێش ئەو شتانەی سەرەوەدا ئاوەڵناوی خاوەندارێتی یان ئامرازی ناساندنی ئەداو بەکار بهێنرێ لەجێگای in, by بەکار دێنین.

He comes here in his car. ئەو بە سەیارەکەی دێت بۆ ئێرە.

*هەروەها وشەی by بەو شێوانەی خوارەوە بەکار دەهێنرێ.

The telephone is by the window. تەلەفونەکە لە قەراغی پەنجەرەکەیە.

The house is heated by gas. ماڵەکە بە گاز گەرم دەبێ.

I'll have it done by tomorrow. من هەتا بەیانی ئەنجامم داوە(ئەنجامی دەدەم)

**١٩- *to*: ئەم وشەیە بەدوای ئەو فرمانانەدا کە شوێن دیاری دەکەن بەکار دەهێنرێ. وەک:**

I went to library. چووم بۆ کتێبخانە.

He cames to work by car. ئەو بە ئوتومبیل هاتە سەر کار.

Her childhood was spent travelling from place to place.

دەورەی منداڵی‌یەکەی بە سەرفەر کردن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك تێپەڕ بوو.

**_بەمانای هەتا – تا بەکار دەهێنرێ. وەک:**

She sang the baby to sleep. ئەو گۆرانی بۆ منداڵەکە وت تا خەوی لێ‌کەوت.

I would say he was 25 to 30 years old. من دەڵێم لە ٢٥ تا ٣٠ تەمەنی‌دا بوو.

**_بۆ کاتژمێرەکان بەو شێوەیە بەکار دەهێنرێ. وەک:**

It's five to ten = five minutes before ten o'clock.

پێنج دەقیقەی ماوە بۆ دە.

**_بۆ پیشاندانی ئەو حاڵەتانە کە کەسێك، شتێك وەردەگرێ بەمانای (بە، بۆ) بەکار دەهێنرێ. وەک:**

He gave a book to his sister. ئەو کتێبێکی دا بە خوشکەکەی.

**_بۆ زانیاری زیاتری ئەو شێوازە بڕواننە (جێناوی کارلێکراو – جێی دوو کارلێکراو لە رستەیەک دا)**

بەمانای (لە – لەگەڵ) بەو شێوەی خوارەوە بەکار دەهێنرێ.

She is married to an Italian.

ئەو لەگەڵ ئیتالیایی‌یەك ژیانی هاوبەش پێك دێنێ.

The Japan's ambassador to France. سەفیری ژاپۆن لە فەرەنسە.

**٢٠-*till*, *until*: ئەم زێدەواژانە بە مانای (تا) بەکار دەهێنرێن. وەک:**

Let's wait until the rain stops. با چاوەڕێ بکەین تا باران دەکاتەوە.

Until now I have always lived alone.

هەتا ئێستا من هەموو کات بە تەنیا ژیاوم.

The street is full of traffic from morning till night.

شەقامەکە لە بەیانی‌یەوە تا شەو ترافیکە. (قەرەباڵغە)

*هەرکات پێویست بێت ئەم وشانە لە سەرەتای رستەوە بێن تەنیا دەتوانین لە until کەڵك وەرگرین و هەروەها هەرکات زێدەواژەی from لە رستەدا بەکاربهێنرێ لەپێش شوێن دا تەنیا دەبێ لە to بە مانای (تا) کەڵك وەرگرین. وەکوو:

I went from Hawler to Suleymaniy. من لە هەولێرەوە چووم بۆ سلیمانی.

**٢١-*between*: ئەم زێدەواژەیە بە مانای انێوان — لە نێوان) بەکار دەهێنرێ. وەك:**

E cams between D and F in English alphabet.

(E) لە ئەلف بێی ئینگلیزیدا لەنێوان (D) و (F) بەکاردەهێنرێ.

Don't eat between meals. لەنێوان ژەمەکان دا شت مەخۆ.

٢٢-***among***: ئەو وشەیەش بە مانای (نێوان — لە نێوان) بەکار دەهێنرێ بەڵام جیاوازییەکی لەگەڵ ***between***هەیە. ***Between*** زیاتر لەنێوان دوو شت یان دوو کەس دا بەکار دەهێنرێ بەڵام ***among*** لەنێوان چەند کەس یان چەند شت دا بەکار دەهێنرێ. وەك:

A house among the trees. ماڵێك لەنێوان دارەکان دا.

It's ok, you are among your friends now.

زۆر باشە، ئێستا تۆ لەناو هاورێکانت دایت.

This attitude is common among the under 25.

ئەم ڕەوشە لەنێوان ژێری ٢٥ ساڵاندا باوە.

**٢٣-*beside*: ئەو زێداواژەیە بە مانای (لە پەنای، لە لای، لە قەراغی) بەکار دەهێنرێ. وەك:**

Sit here beside me! لێرە لە پەنام دانیشە !

٢٤-***besides***: ئەم زێدەواژەیە (جگە لە، بێجگە لە) بەکار دەهێنرێ کە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ مانای ***beside*** هەیە دەبێ سەرنج بدەینە شێوەی بەکار هێنانیان تا لەنێوان ئەو دوو وشەیەدا هەڵە نەکەین.

What other sports do you play besides hockey?

جگە لە هاکی چ یارەکی دیکە دەکەی؟

٢٥-***over, above***: ئەم دوو وشەیە هەردووکیان بە مانای (لەسەر، سەروی) بەکار دەهێنرێن بەڵام چەند جیاوازییەك لە نێوانیان دا هەیە.

Over لە کاتێکدا بەکار دەهێنرێ کە شتێك لەسەر شتێکی دیکەوە بێ یانی ڕێك لە بەروی ئەوەوە بێ. بەڵام above بەو مانایە کە شتێك لە سەرووی شتێکی دیکەوە بەڵام مەرج نیە ڕێك لە سەرەوی ئەودابێ. وەك:

There is a bridge over the rivet. پردێك بەسەر ڕووبارەکەوەیە.

We were flying above the clouds. ئێمە لەسەری هەورەکانەوە هەڵدەفڕین.

**_بۆ جێگۆڕین لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر لە *over* کەڵك وەردەگرین.**

They jumped over the stream. ئەوان لەسەر جۆگەکەوە پەڕینەوە.

**_بۆ داپۆشین دەبێ لە over کەڵك وەرگرین.**

He put a blanket over the sleeping child.

لێفەیەکی بەسەر منداڵە خەوتووەکەدا کێشا.

**_بۆ ماوەی نێوان شوێنەکان لە above کەڵك وەردەگرین. وەك:**

2000 feet above sea level.

دوو هەزار پێ لەسەرووی ئاستی دەریاوە.

***over زیاتر لەگەڵ ژمارە، تەمەن، پارەو کات بەکار دەهێنرێ. وەك:**

He is over 50. ئەو لە سەرووی پەنجا ساڵ دایە.

It costs over $ 100. نرخەکەی لەسەرووی ١٠٠دۆلار دایە.

We waited over 2 hours. ئێمە زیاتر لە دوو سەعات چاوەڕێمان کردن.

**٢٦-*under, below*: ئەم دوو وشەیە بە مانای (ژێر، لە ژێرا بەکار دەهێنرێن لە راستیدا under پێچەوانەی over ەو below پێچەوانەی above ە. وەك:**

There is a river under the bridge. لەژێر پردەکەدا رووبار هەیە.

please don't write below this line. تکایە لەژێر ئەم خەتەدا مەنووسە.

**سەرنج:**

بۆ دۆخەکانی کەش و هەوا لە وشەکانی above, below کەڵك وەردەگیرێ.

Temperature won't rise above zero tonight.

پلەی هەوا ئەمشەو لە سفر ناچێتە سەرێ.

The temperature today ten degree below 0.

هەوا ئەمرۆ ١٠پلە لەژێر سیفر دایە.

**٢٧-*behind*: ئەم زێدەواژەیە بە مانای (لە پشتی، لە پشتەوە، لەدوای).**

Don't forget to lock the door behind you.

بیرت نەچێ درگاکە بەدوای خۆت دا داخەی.

The sun disappeared behind the clouds.

خۆر لە پشت هەورەکاندا ون بوو.

*ئەمانە چەند دانە لەو زێدەواژە گرینگانە بوون کە لە ئینگلیزیدا بە زۆری بەکار دەهێنرێن.

***

## زاراوەی کرداری (ئایدیۆم) :Idiom

لە ئینگلیزیدا هێندێك وشە هەن کە لە دوو وشەی جیاواز پێك هاتوون بۆوێنە وشەی give in کە بە مانای (خۆ بەدەستەوەدان) بەکار دەهێنرێ، لە حاڵێك دا ئەگەر هەرکام لە وشەکانی in – give بەجیا بەکار بێنین مانای تایبەت بە خۆیان هەیە بەڵام کە بەو شێوەیە بەدوای یەکدا بێن ئەو مانا تازەیە دروست دەکەن.

لە زمانی ئینگلیزیدا بەکارهێنانی ئەو زاراوانە و ژمارە یان زۆرەو دەبێ بە جوانی سەرنجیان بدەینێ بۆ ئەوەی هەڵەی تێدا نەکەین. **لێرەدا بەشێك لەو زاراوانە دەنووسین.**

| | |
|---|---|
| make a decision = make up (one's)mind | بڕیاردان |
| be afraid | ترسان |
| be willing (to) | پێخۆش بوون |
| change (one's)mind | پەشیمان بوونەوە |
| make a choice | هەڵبژاردن بۆ شت(دەست بژێر کردن) |
| make a difference | جیاوازی دانان |
| have a good time | کاتێکی خۆش بەسەر بردن |
| take a trip | بۆ سەفەر چوون |
| be accustomed to | خووگرتن (ڕاهاتن) |
| be up and around | بەگوڕ بوون |
| take care of | چاودێری کردن |
| take pills | دەرمان خواردن |
| all right | زۆر باشە |
| occur to somebody | وەبیر هاتنەوە |
| outgrow | گەورە بوون- زۆرتر پێگەیشتن |
| point of view | بۆ چوون (ڕا) |
| after all | لەسەر یەك |
| get rid of | ڕزگار بوون لە دەست ... |
| go off | تەقینەوە -- خراپ بوون — فیشەك دەرچوون |
| pay attention | سەرنجدان — گوێدان |
| get cold | سەرمابوون (هەڵامەت گرتن) |

let(one's)know ئاگادار کردنەوە لەجێگای (one's)ناوەڵناوی خاوەنداریەتی دادەنرێ.

at all بە هیچ شێوەیەك

be indebted قەرزار بوون

arrive at گەیشتن بە شوێنی چووکە

arrive in گەیشتن بە شوێنی گەورە

come on = hurry up = be quick خێراکە

call up = ring up تەلەفون کردن

do (one's)a favour چاکە کردن بۆ کەسێك

لەجێگای (one's)جێناوی کارلێکراو دادەنرێ

find out زانین (تێگەیشتن)

get on = get in to سوار بوون

get off = get out of دابەزین

here you are فەرموو(تعارف کردن بۆ وەرگرتنی شت)

go ahead فەرموو (تعارف کردن بۆ رۆیشتن یان ئەنجامدانی کارێك)

get up لەخەو هەڵسان

go over دەورکردنەوە

by the way بە راست

go on درێژەدان

make off = run away هەڵاتن

put on لەبەر کردن

put off خستنە دواوە (بۆ چاوپێکەوتن)

try on بۆ تاقیکردنەوە لەبەرکردن (تەنیا بۆ جوبەرگو پۆشاك)

turn on هەڵکردن (شتە کارەباییەکان)

turn off کوژاندنەوە

turn up زۆر کردن (دەنگی رادیۆ، تەلەفیزیۆن)

turn down کەم کردن (دەنگی رادیۆ، تەلەفیزیۆن)

be surprised = be astonished سەر سورمان

depend on پشت بەستن بە کەسێك یان شتێك

*ئەوانەی لە سەرەوە هاتوون بەشێکی کەم لەو زاراوانەن کە هەروەك باسمان کردن بەکارهێنانیان لە ئینگلیزیدا زۆرە بۆ زیاتر ناسینی ئەوان پێویستە سەرنج بدەنە فەرهەنگە باشەکان، کە لە بەشێك دا دوای مانای ئەسڵی وشەکان باسی لەسەر کردوون بۆ وێنە فەرهەنگی Oxford لەدوای باسی هەر وشەیەك ئەوەی کە زاراوەی هەبێ ئەو رەسمەی خوارەوەی کێشاوەو بەدوایدا بەکاری هێناوە.

**IDM**

## شێوەی بەکارهێنان و شوێنی زێدەواژەکان لە زاراوەی کرداریدا:

هەروەك باسمان کرد لە تێکەڵبوونی دوو وشە وەك فرمانێك و زێدەواژەیەك زاراوەی کرداری دروست دەبێ کە تارادەیەك باسمان کرد و چەند نموونەیەکمان هێناوە.

لێرەدا پێویستە باسی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەوان، شوێنی زیدەواژەکان باس بکەین.

ئەم زاراوانە بەدوو جۆر دابەش دەکرێن.

**١-ئەو زاراوانەی لێك جودا دەبنەوە:**

لەم جۆرانەدا هەرکات ناو بەکار بهێنرێ دەتوانین لەنێوان فرمان و زێدەواژەکەدا بەکار بێنین و هەروەها دەتوانین لەدوای زێدەواژەیش بەکاری بێنین. بەڵام هەرکات جێناو لەجێگای ناو بەکار بهێنرێ تەنیا دەتوانین لەنێوان فرمان و زێدەواژەدا بەکاری بێنین. وەکوو:

Please turn on the light. — تکایە گڵۆپەکە بکوژێنەوە.

Please turn it on. — تکایە بیکوژێنەوە.

*لەم شێوازەدا هەرکات کارلێکراوەکە دوورو درێژ بوو یان چەند کارلێکراو لە رستەکەدا هەبوو دەکەونە پاش زێدەواژەوە. وەك:

Please put on your shoes, your coat and your hat.

تکایە کەوش و کڵاو و کۆتەکەت لەبەر کە.

**٢-ئەو زاراوانەی لێك جودا نابنەوە:**

**ئەم شێوە زاراوانە هیچ کات لێك جیا نابنەوەو چ ناو بەدوایاندا بەکار بهێنرێ و چ راناو بەکار بهێنرێ. وەك:**

He goes over the events of the day in his mind.

ئەو پێشهاتەکانی رۆژانەی لە مێشکی خۆیدا دەور دەکردەوە.

*بۆ زانیاری زیاتر چەند نموونەیەك لە هەردووك جۆر زاراوەكان دەنووسین كە بەكارهێنانیان لەكاری ڕۆژانەدا زۆرە.

| ئەو فرمانانەی لێك جودا دەبنەوە | ماناكان | ئەو فرمانانەی لێك جودا نابنەوە | ماناكان |
|---|---|---|---|
| turn up | زۆر كردنی (دەنگ) | get up | لە خەو هەستان |
| turn down | كەم كردنی (دەنگ) | get on | كاربوون |
| turn off | كوژاندنەوە | come back | گەڕانەوە |
| turn on | هەڵ كردن | call on | سەردانی كردنی كەسێك |
| put off | خستنە دواوە | listen to | گوێ گرتن لە |
| put on | لەبەر كردن | go over | دەور كردنەوە |
| throw away | فڕێ دان | call at | سەردانی شوێنێ كردن |
| pick up | هەڵ گرتن | get off | دابەزین |
| take apart | جودا كردن | jump over | پەڕین – بازدان |
| ring up | تەلەفون كردن | ran out | تەواو بوون |
| ring back | هێناوە | look at | چاوكردن لە كەسێك یان شتێك |
| find out | تێ گەیشتن | look out | ئاگا لێبوون ، چاودێری كردن |
| leave out | لابردن – سڕینەوە | wait for | چاوەڕێ بوون |
| ring back | هێنانەوە | go on | درێژە پێدان |
| look up | بەدوای وشەدا گەڕان | search for | بەدوای كەسێك یان شتێك دا گەڕان |
| take over | تسە لەسەر كردن | look forward to | چاوەڕێ بوون |

*ئەمانەیش ژمارەیەك لەو زاراوانەن كە لێك جودا دەبنەوە. هەروەك باسمان كرد هەركات ناو بەكار بهێنرێ دەتوانین لەدوای ئەوانەوە یان لەنێوانیان دا بەكاری بێنین، بەلام جێناوەكان هەموو كات دەكەونە نێوانیانەوە.*

*ئەمانە بەشێك لەو فرمانانەن كە لێك جودا نابنەوە هەر بەو شێوەی نووسراون لە ڕستەكان دا بەكار دەهێنرێن تێبكۆشن وشەی لەو بابەتە بدۆزنەوە هەتا هەڵە لە بەكارهێنانیان دا نەكەن.*

## پێشگرو پاشگر Prefix and Suffix:

پێشگرو پاشگر بریتی‌یە لەو پیتانە کە لە سەرەتا یان کۆتایی وشەیەك دا بەکار دەهێنرێن‌و ئالوگۆڕێك لە ماناکەی‌دا پێك دێنن.

ناسینی ئەمانە یەکێك لەو خاڵانەیە کە فێربوونی ئینگلیزیان بۆ ئاسان دەکاتەوەو بەشێکی زۆر لە گرفتەکانمان لا دەبا.

بە ناسینی ئەوان دەزانین ئەو وشەی لەبەر دەست دایە (فرمانە، ئاوەڵناوە، ئاوەڵفرمانەو ...هتد) لێرەدا باسی ئەو پێشگرو پاشگرە گرینگانە دەکەین کە بە زۆری بەکار دەهێنرێن‌و بۆ هەرکام چەند نموونەیەك دێنینەوە.

## پێشگرەکان Prefix:

پێشگرەکان لە سەرەتای وشەکانەوە بەکار دەهێنرێن کە بریتین لە:

***(il, ir, im, in, mis, un, dis, en, em)***

لەو پێشگرانەی سەرەوە em و en وشەکان دەکەنە فرمان‌و هەمووی ئەو پێشگرانەی دیکە وشە یان فرمانە ئەرێ (positive)ەکان دەکەنە نەرێ negative.

| پێشگرەکانی em و en کە وشەکان دەکەنە فرمان | | | |
|---|---|---|---|
| وشەکان | ماناکان | پێشگرەکانی em | ماناکان |
| bitter | تاڵ – تیژ | *em*bitter | تاڵکردن |
| power | هێز – توانا | *em*power | بەهێزکردن |
| place | شوێن | *em*place | لە شوێنی دانان |
| پێشگرەکانی en | | | |
| snarl | داو – گرێ | *en*snarl | داو کردن |
| sure | دڵنیا | *en*sure | دڵنیا بوون |
| venom | ژەهر | *en*venom | ژەهراوی کردن |
| case | سندووق | *en*case | لە سندوق دانان |

| ئەو پێشگرانەی وشە (*positive*)ەکان دەکەنە *negative* | | | |
|---|---|---|---|
| وشەکان | ماناکان | پێشگری dis | ماناکان |
| belief | بروا- سیقە- ئیمان | ***dis***belief | بێبڕوایی – بێئیمان |
| quiet | ئارام- بێدەنگ- هێواش | ***dis***quiet | ئائارم- شێواو-بێقەرار |
| similar | وەکوو یەك- وەك یەك | ***dis***similar | جیاواز- لێك نەچوون |
| | | پێشگرەی il | |
| libral | ئازادیخواز- رۆشنبیر | ***il***libral | دژی ئازادی- پاوانخواز |
| legal | یاسایی – حەلاڵ | ***il***legal | نایاسایی- حەرام |
| treat | هەڵسوکەت کردن- دەرمان کردن | ***il***treat | خراپ هەڵسوکەوت کردن – خراپ کردن |
| | | پێشگرەی im | |
| modest | بەحەیا – بە شەرم | ***im***modest | بێحەیا – بێشەرم |
| pious | خواناس – بە ئیمان | ***im***pious | بێئیمان – خوانەناس |
| pure | خاوێن | ***im***pure | پیس - چڵکن |
| | | پێشگرەی in | |
| sane | تێگەیشتوو – ئاقڵ | ***in***sane | شێت – بێعەقڵ |
| satiable | تێر – قانع | ***in***satiable | برسی – تێرنەخۆر |
| complete | تەواو - بێعەیب | ***in***complete | ناتەواو – عەیب دار |
| | | پێشگرەی ir | |
| reconcilable | پێك هاتوو | ***ir***reconcilable | دژ – پێك نەهاتوو |
| regular | رێكو پێك | ***ir***regular | نارێك – ناجۆر |
| | | پێشگرەی mis | |
| send | ناردن | ***mis***send | بە هەڵە ناردن |
| read | خوێندنەوە | ***mis***read | خراپ خوێندنەوە |
| | | پێشگرەی un | |
| known | ناسراو | ***un***known | نەناسراو |
| merciful | دڵسۆز – بە رەحم | ***un***merciful | دڵرەق - بێرەحم |

## پاشگرەکان suffixes:

پاشگر بریتی‌یە لە چەند پیت کە لە کۆتایی وشەیەك دا بەکار دەهێنرێ. پاشگرەکان لـە ئینگلیزیدا بریتین لە:

**ation, ment, tion, ence, al, ing, y, ist, dom, ship. hood, ive, ify, less, ful, ity, isn, some, like, able, ize, en, er**

لێرەدا تارادەیەك باسی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو پاشگرانە دەکەین.

**پاشگرەکانی *y, ing, al, ence, tion, ation, ment* لە کۆتایی فرمانەکانەوە دێن و دەیانکەنە ناو. وەک.**

| arrist | گرتن- دەسگیر کردن | arrist*ment* | گیراو |
|---|---|---|---|
| inform | ئاگادار کردن | inform*ation* | ئاگاداری |
| translat | وەرگێران | translat*ion* | وەرگێردراو |
| appear | دەرکەوتن | appear*ance* | دەرکەوتوو |
| Differ | جیاواز بوون | differ*ence* | جیاواز |
| propos | پێشنیار کردن | propos*al* | پێشنیار |
| happan | پێش هاتن | happan*ing* | پێش هات |
| unit | یەك گرتن | unit*y* | یەکگرتوو |

**پاشگرەکانی *ship, hood, ist* سەرچاوەکەیان ناوەو ناوەکە دەکەنە ناوێکی‌تر. وەک:**

| child | منداڵ | child*hood* | سەردەمی منداڵی- منداڵی |
|---|---|---|---|
| Leader | ڕێبەر | leader*ship* | ڕێبەری |
| geolog | زەوی ناس | geolog*ist* | زەوی ناسی |
| friend | هاورێ | friend*ship* | هاورێیەتی |

## ئەو پاشگرانەی کە فرمان دەکەنە ناوەڵناو بریتین لە : ive, able, less

| fear | ترسێن | fear*less* | نەترس - بێباك |
|---|---|---|---|
| eat | خواردن | eat*able* | خواردەمەنی |
| agress | زوڵم کردن – تەعەداکردن | agress*ive* | زاڵم – دەست درێژکەر |

## ئەو پاشگرانەی کە ناوەڵناو دەکەنە فرمان بریتین لە : ify, en, ize

| personal | کەس | personal*ize* | کەسایەتی پێدان |
|---|---|---|---|
| short | کورت | short*en* | کورت کردن |
| less | کەمتر | less*en* | کەمتر کردن |
| simpl | ئاسان - بسیط | simpl*ify* | ئاسان کردن |

## پاشگرەکانی ness, ship, hood, ity, do, ناوەڵناوەکان دەکەنە ناو.

| white | سپی | white*ness* | سپیەتی |
|---|---|---|---|
| False | درۆ – جەعل | false*hood* | درۆ |
| timid | ترسنۆك | timid*ity* | ترسنۆکی |
| free | ئازاد – سەربەخۆ | free*dom* | ئازادی - سەربەخۆیی |
| hard | قورس – ناخۆش | hard*ship* | ناخۆشی |

## ئەو پاشگرانە فرمانەکان دەکەنە ناوی بکەر کە بریتین لە: or – er

| Play | یاری کردن | play*er* | یاریزان |
|---|---|---|---|
| Vanquish | سەرکەتن – بردنەوە لە | vanquish*er* | سەرکەوتوو |
| translat | وەرگێران | translat*or* | وەرگێڕ |

**پاشگرەكانی able, ful, like, ish, some, less ناوەكان دەكەنە ناوەڵناو و هەروەها less حاڵەتی نەرێ بە ناوەڵناوەكە دەدات.**

| sense | هەست | sense*less* | بێهەست |
|---|---|---|---|
| child | منداڵ | child*less* | بێمنداڵی – وەجاخ كوێر |
| man | پیاو | man*like* | پیاوانە |
| child | منداڵ | child*ish* | منداڵانە |
| law | یاسا | law*ful* | یاسایی |
| Comfor | ئاسایش – خۆشی | comfort*able* | بە ئاسایش – بە خۆشی |
| trouble | ئەرك – ناخۆش | trouble*some* | بە ئەرك – ناخۆشی |



## فرمانی نادیار The Passive:

لەپێش دا بە وردی باسی شێوەی بەکارهێنانو چۆنیەتی دروست کردنی دەمەکانمان کرد، هەروەك لەو باسانەدا دێتە بەرچاو لە دروست کردنی هەموو دەمەکان دوو شتی زۆر گرینگ لەبەرچاو دەگیرێ کە بکەرو فرمانو لەهەموو دەمەکاندا دەبێ بەکاریان بێنین.

لە دروست کردنی ئەو دەمانەدا کە باسمان کرد فرمانەکان بە شێوەی فرمانی دیار active بەکار هێنراون.

لێرەدا پێویستە باسی بەکار هێنانی فرمانەکان بە شێوەی نادیار passive بکەین بۆ بەکار هێنانی فرمانی نادیار پێویستە دوو خاڵی گرینگ لەبەرچاو بگرین.

**١-فرمانەکە دەبێ تێپەڕ transitive بێ.**

**٢-ڕستەکەمان بکەری نەبێو بەسترابێتەوە بە کارلێکراوەوە.**

لەئینگلیزیدا فرمانە ئەسڵییەکان دەبنە دوو جۆر کە بریتین لە :

**١-فرمانی تێنەپەڕ Intransitive Verb (لازم)**

**٢-فرمانی تێپەڕ Transitive Verb (متعدی)**

فرمانی تێپەڕ بەو فرمانە دەڵێن کە پێویستی بە کارلێکراو بێ. یانی بەبێ کارلێکراو ڕستەکەمان مانای نابێ بەڵام فرمانی تێنەپەڕ ئەو فرمانەیە کە ڕستەکە پێویستی بە کارلێکراو نیەوبە تەنیا مانا دەدات. وەك:

| | |
|---|---|
| I sleep. | من دەخەوم. (تێنەپەڕ) |
| I give him my book. | من کتێبەکەمم پێدا. (تێپەڕ) |

**سەرنج.**

هێندێك لە دەمەکان بەشێوەی فرمانی نادیار بەکار ناهێنرێن یان بەکارهێنانیان زۆر زۆر کەمو دەگمەنە، کە بریتین لە:

( دەمەکانی ئێستای بەردەوامی تەواو و ڕابردووی دووری بەردەوام، دەمە بەردەوامەکانی داهاتوو ).

لێرەدا باسی شێوەی بەکارهێنانی فرمانی نادیار بەپێی دەمەکان دەکەین.

### دەمی ئێستای سادە (فرمانی نادیار):

هەروەکباسمان کرد فرمانی نادیار بکەری نیەو بەڕێوەچوونی کارەکە بەستراودتەوە بە کارلێکراوەوە یان هێندێك جار بەو هۆیە کە دەمانەوێ زیاتر تەکید لەسەر کارلێکراو بکەین ڕستەکەمان بەو شێوەیە بەکار دەهێنین.

بۆ دروست کردنی فرمانی نادیار بۆ ئەم دەمەو هەموو دەمەکانی دیکەیش پێویستە لـە ناوی کارلێکراوی فرمان کەڵك وەربگرین.

لە دەمی ئێستای سادەدا ناوی کارلێکراو لەگەڵ سـەرفکراوی فرمـانی to be بـۆ ئـەم دەمە بەدوای کارلێکراودا کە لەم جۆرە رستانەدا لە سەرەتای رستەدا بـەکار دەهێنـرێن بـەیان دەکرێ. وەك:

English is spoken all over the world.

ئینگلیزی لە تەواوی دنیا قسـەی پێدەکرێ.

Renault cars are made in france.

سەیارە رینۆلیتەکان لە فەرەنسا دروست دەکرێن.

Is English spoken all over the world.

ئایا زمانی ئینگلیزی لە تەواوی دنیا قسەی پێ دەکرێ؟

***بۆ شێوەی negative تەنیا not بەدوای فرمانی to be بەکار دەهێنرێ. وەك:***

Renault cars aren't mode in Greece.

سەیارە رینۆلیتەکان لە یونان دروست ناکرێن.

**نموونەیەك بۆ گۆڕینی فرمانی دیار بۆ نادیار**

| (فرمانی دیار) | ئەو من بانگهێشت دەکات. | He invites me. |
|---|---|---|
| (فرمانی نادیار) | من بانگهێشت دەکرێم. | I am invited. |

***لێرەوە بۆ هەموو دەمەکان دوو رستەی دیارو نادیار وەك نموونە بەکار دێنین.***

## دەمی ئێستای سادەی بەردەوام، فرمانی نادیار:

بۆ دروست کردنی فرمانی نادیاری دەمـی ئێسـتای سـادەی بـەردەوام، پێویسـتە نـاوی کارلێکراوی فرمانی مەبەست بەدوای beingدا و پێش ئەویش سەرفکراوی to be بـۆ دەمـی ئێستا بەکار بهێنین.

They are reading book.

(فرمانی دیار) ئەوان خەریکن کتێب دەخوێننەوە.

The book is being read.

(فرمانی نادیار) کتێبەکە خەریکە دەخوێندرێتەوە.

بـۆ شـێوە پرسـیاری تـەنیا فرمـانی to be دێنینـە سـەرەتای رسـتەوەو بـۆ شـێوەی negative تەنیا not بەدوای ئەو فرمانانەدا بەکار دێنین. وەك:

Isn't the letter being written?. ئایا نامەکە نانووسرێ؟

**دەمی ڕابردووی سادە (فرمانی نادیار):**

بۆ دروست کردنی ئەو جۆرە فرمانە پێویستە ناوی کارلێکراوی فرمانی مەبەست بەدوای سەرفکراوی فرمانی to be بۆ دەمی ڕابردوو بەکار بێنین. وەك:

A loud noise frightened the animals.

(فرمانی دیار) دەنگێکی بەرز ئاژەڵەکانی ترساند.

The animals were frightened by a loud noise.

(فرمانی دیار) ئاژەڵەکان بەهۆی دەنگێکی بەرزەوە ترسان.

**دەمی ڕابردووی سادەی بەردەوام (فرمانی نادیار):**

بۆ دروست کردنی فرمانی نادیاری دەمی ڕابردووی سادەی بەردەوام پێویستە لە یاسای (ناوی کارلێکراو + to be + being) کەڵك وەربگرین. وەك:

The letter was being written. (فرمانی نادیار) نامەکە خەریك بوو دەنووسرا.

He was writing the letter. (فرمانی دیار) ئەو خەریك بوو نامەکەی دەنووسی.

**دەمی ئێستای تەواو (فرمانی نادیار):**

بۆ دروست کردنی فرمانی نادیار لە دەمی ئێستای تەواودا لەو یاسایە کەڵك وەردەگرین. (ناوی کارلێکراو + has=have +been ) وەکوو:

He hasn't invited me since 2002.

ئەو لە ساڵی ۲۰۰۲وەوە منی بانگهێشت نەکردوە. (دیار)

I haven't been invited since 2002 by him .

من لە ساڵی ۲۰۰۲وەوە لەلایەن ئەوەوە بانگهێشت نەکراوم. (نادیار)

Has you car been repaired?

ئایا سەیارەکەت چاك کراوەتەوە؟ (نادیار)

**دەمی ڕابردووی دوور(فرمانی نادیار):**

یاسای (ناوی کارلێکراو + had + been ) بۆ دروست کردنی ئەم دەمە بەکار دەهێنرێ.

They had eaten the dinner before he came. (دیار)

پێش ئەوەی ئەو بێت ئەوان شیوەکەیان خواردبوو.

The dinner had been eaten before he came. (نادیار)

پێش ئەوەی ئەو بێت شیوەکە خواربوو.

**دەمی داهاتووی سادە (فرمانی نادیار):**

بۆ دروست كردنی ئەم دەمە وەك هەموو دەمەكانیتر لە ناوی كارلێكراوی فرمانی مەبەست لەگەڵ will be كەڵك وەردەگرین. وەك:

He will invited us tomorrow.

ئەو سبەینێ ئێمە بانگهێشت دەكات. (دیار)

We will be invited tomorrow.

ئێمە سبەینێ بانگهێشت دەكرێین. (نادیار)

Will you be invited tomorrow?

ئایا تۆ بەیانی بانگهێشت دەكرێی؟ (نادیار)

**دەمی داهاتووی سادە لە ڕابردوودا (فرمانی نادیار):**

بۆ فرمانی نادیاری ئەم دەمە كەڵك لەم یاسایە وەردەگرین.

(ناوی كارلێكراو + would be).

She said that she would write a book about geography of Kurdistan.

ئەو وتی كتێبێك لەبارەی جوگرافیای كوردستانەوە دەنووسێ. (دیار)

She said that a book about geography of Kurdistan would be written.

ئەو وتی كتێبێك لەبارەی جوگرافیای كوردستانەوە دەنووسرێ. (نادیار)

**دەمی داهاتووی تەواو (فرمانی نادیار):**

یاسای (ناوی كارلێكراو + will + have +been) بۆ دروست كردنی فرمانی نادیاری ئەم دەمە بەكار دەهێنرێ.وەكوو:

They will have finished their work by next week.

(دیار) ئەوان تا حەوتووی داهاتوو كارەكەیان تەواو كردووە. (تەواوی دەكەن)

Their work will have been finished by next week.

(نادیار) كارەكەیان هەتا حەوتووی داهاتوو تەواو بوود. (تەواو دەبێ)

***

## دەمی داهاتووی تەواو لە ڕابردوودا (فرمانی نادیار):

بۆ دروست کردنی فرمانی نادیاری ئەم دەمە لە یاسای:

(ناوی کارلێکراو + would + have + been ) کەڵك وەردەگرین.

وەکوو:

He said that they would have finished their work in tomorrow.

(دیار) ئەو وتی کە ئەوان کارەکەیان تا سبەینێ تەواو کردووە. (تەواوی دەکەن)

He said that their work would have been finished in tomorrow.

(نادیار) ئەو وتی کە کارەکە تا سبەینێ تەواو بووە. (تەواو دبێ)

*ئەوانەی تا ئێستا باسمان کرد شێوەی بەکارهێنانی فرمانی نادیار لە دەمەکان دا بوو و هەروەك نموونەکان کە بۆ هەردووك شێوەی (دیار) (نادیار) بەکار هاتووە دەبینین کە کارلێکراوی فرمانە دیارەکان هاتۆتە سەرەتای ڕستە نادیارەکانو تەکیدی زیاتر لەسەر ئەم بەشەی ڕستە کراوە پێویستە ئەوەیش بڵێین کە فرمانە تێنەپەڕەکان ناکرێنە (نادیار)و تەنیا دەتوانین بەشێوەی دیار لە ڕستەدا کەڵکیان لێوەرگرین.

- هێندێك فرمانمان هەیە کە لە هێندێك شوێن تێپەڕ و لە هێندێك شوێن تێنەپەڕن.

ئەو جۆرە فرمانانە لەو کاتەدا وەك (تێنەپەڕ) بەکار دەهێنرێن ناکرێنە نادیار بەڵام هەرکات وەك تێپەڕ بەکارهێنران دەتوانین بیانکەینە نادیار. وەکوو:

I saw her in the street but we didn't speak.

(فرمانی تێنەپەڕ) من لە شەقامەکەدا دیم بەڵام قسەمان نەکرد.

We spoke Kurdish in the meeting.

فرمانی تێپەڕ (دیار) ئێمە بە کوردی لە کۆبوونەوەکە قسەمان کرد.

Kurdish was spoken in the meeting.

فرمانی تێپەڕ (نادیار) لە کۆبوونەوەکەدا بە کوردی قسە کرا.

هەروەك دەبینرێ لەو ڕستەیەدا کە قسەکردن بە کوردیە فرمانەکە تێپەڕە (یانی هەم دەکرێ بە دیارو هەم نادیار)

*هەرکات ڕستەیەکی دیار بە وشەکانی پرسی what, where, when و ...هتد
پرسیاری کرابێ هەر بەو وشانە دەکرێنە نادیار. وەك:

What did you eat? — چیت خوارد؟ (دیار)

What was eaten? — چی خورا؟ (نادیار)

How did he broke the window? — چۆن پەنجەرەکەی شکاند؟ (دیار)

How was the window broken? — پەنجەرەکە چۆن شکا؟ (نادیار)

*هەرکات ڕستە دیارەکە بە وشەی پرسی who دەست پێبکا by whom جێگای
دەگرێتەوەو هەرکات بە وشەی پرسی whom دەست پێبکات دەبێتە who. وەك:

Hho will buy my car? — کێ ئوتومبیلەکەی من دەکڕێ؟ (دیار)

By whom will my car be bought?

ئوتومبیلەکە لە لایەن کێوە دەکڕدرێ؟ (نادیار)

*هەرکات ڕستەکەمان دوو کارلێکراوی هەبێ باشتر ئەوەیە کارلێکراوی کەس لە ڕستە نادیارەکان دا بێنینە سەرەتای ڕستەوە.

وەکوو:

I give him a book. — من کتێبێکی پێ دەدەم. (دیار)

he is given a book. — ئەو کتێبێکی پێ دەدرێ. (نادیار)

*دەتوانین ئەو ڕستەیە بەو شێوەیەش بنووسین.

A book is given to him. — کتێبێك بەو دەدرێ.

*هەروەك باسمان کرد لە ڕستە نادیارەکان دا بکەر لادەچێ بەڵام هەرکات پێویست بێ
ئاماژەیەکی کورت بە بکەر بکەین لە زێدەواژەی by لەکۆتایی ڕستەکەدا کەڵك وەردەگرین و
لەدوایدا بکەر بەکار دێنین بەڵام هەرکات بکەر شت (بێگیان) بێت لە جێی with, by بەکار
دەهێنین.

The thieves weren’t seen ***by*** anyone. (نادیار)

دزەکان لەلایەن هیچ کەسەوە نەبینران.

Rain has wetted my hair. — باران قژی منی تەڕ کردووە. (دیار)

My hair has been wetted <u>with</u> rain. — قژی من بە باران تەڕ بووە (نادیار)

*ئەو فرمانانەی کە لە ڕستە دیارەکان دا بە چاوگی بێ to بەکار دەهێنرێن لە ڕستە
نادیارەکان دەبنە چاوگ.

نموونەکان:

I saw him go out. من دیتم چووە دەری. (دیار)

He was seen to go out. ئەو بینرا چووە دەرێ. (نادیار)

*فرمانی let لەهەر دوو شێوەکەدا فرمانی دوای خۆی بە چاوگی بێ to بەکار دێنێ.

He let us go. ئەو ئیزنی بە ئێمە دا بڕۆین. دیار

We were let go. ئێمە ئیزنمان بوو بڕۆین. نادیار

---

## بەکارهێنانی فرمانی هۆکاری Causative Use of :Have To Have

لە ئینگلیزیدا جۆرە ڕستەیەك هەیە كە بكەری ڕستەكە كارێك ئەنجام نادات بەڵام دەبێتە هۆكاری بەڕێوەچوونی كارێك.

بۆ دروست كردنی ئەو جۆرە ڕستانە لە فرمانەكانی to have و to get كەڵك وەردەگرین.

_فرمانی هۆكاری، وەك دەمەكان دەتوانین بە دوو شێوەی دیارو نادیار بەكاری بێنین.

**بۆ فرمانی دیار بەو شێوەی خوارەوە بەکاری دێنین:**

I have my sister wash my shirt.

کراسەکەم ئەدەم بە خوشکم بیشوات.

I had a mechanic repair my car.

ئوتومبیلەکەم دا بە میکانیك (فیتەر)ێك بۆم چا کاتەوە.

*هەروەك دەبینین فرمانی ئەسڵی بەشێوەی چاوگی بێ to بەكارهێنراوە بەڵام هەرکات لە جێگای have , got بەکاری بێنین پێویستە فرمانەکان چاوگی تەواو بن. وەك:

I got a mechanic to repair my car. هەمان مانای سەرەوەی هەیە.

**★بۆ فرمانی نادیار دەبێ ئەو شێوازەی خوراەوە بەکار بێنبن.**

I have my shirt washed.

کراسەکەم ئەدەم بیشۆن.

I had my car repaired.

من ئوتومبیلەکەم دا بۆم چاك کەنەوە.

*هێندێك جار بەکارهێنانی ئەم ڕستانە وەك پێویستی‌یەك بەکار دەهێنرێ. وەك:

I have got to get my sister to drink her milk.

من مەجبوورم شیرەکە بدەم بە خوشکم بیخواتەوە.

## قسەگێڕانەوەی ڕاستەوخۆو ناڕاستەخۆ Direct and Indirect Speech :

لەزمانی ئینگلیزیدا بۆ قسەگێڕانەوە دوو شێوازمان هەیە.

۱)*قسەگێڕانەوەی ڕاستەخۆ* ***Direct***:

۲)*قسەگێڕانەوەی ناڕاستەخۆ* ***Indirect***:

لە قسەگێڕانەوەی ڕاستەخۆدا بێئەوەی کەمترین ئاڵوگۆڕ بەسەر (فرمان، بکەر، جێناو، ئاماژەکراو، ئاوەڵناوی خاوەنداریەتی) بێنین. ڕستە وەك خۆی دەمێنێتەوە بەلام لە قسەگێڕانەوەی ناڕاستەوخۆدا ئاڵوگۆڕێکی زۆر بەسەر ڕستەکەمان دێت کە بە وردی باسی لێوە دەکەین.

لە ڕستە ڕاستەخۆکان دا ئەو خاڵانەی ژێرەوە لەبەرچاو دەگیرێ.

ڕستەکە پێویستی بەو شتانە هەیە:

۱-فرمانی قسەگێڕەوە.

۲-بەدوای فرمانی قسە گێڕەوە (,) بەکار دەهێنرێ کە پێی دەوترێ comma.

۳-هەموو وشەکانی قسەکەر دەخەینە ناو (,, ،،) کە لە ئینگلیزیدا پێی دەڵێین.

*" Quotation marks"*

**نموونەی ڕستە ڕاستەوخۆکان:**

ئەو وتی من مامۆستایەکم.

He said, ''I am a teacher.''

فرمانی قسەگێڕەوە ڕستەی ڕاستەوخۆ

She said, '' I'm reading a book.''

ئەو وتی خەریکی خوێندنەوەی کتێبێکم.

They said, ''We are going out.''

ئەوان وتیان ئێمە خەریکین دەچینە دەرێ.

He said, ''We have lived in his city. ''

ئەو وتی ئێمە لەم شارە ژیانمان کردووە.

لە قسەگێڕانەوەی ناڕاستەوخۆدا پێویستە هێندێك ئاڵوگۆڕ بەسەر ڕستەکەدا بێنین.

چۆن ڕستەیەکی ڕاستەوخۆ بکەینە ناڕاستەوخۆ.

*بۆ زانینی ئەم خاڵە پێویستە کە جۆری ڕستەکان لە زمانی ئینگلیزیدا بناسین پاشان بۆ ناڕاستەخۆ کردنیان سەرنج بدەینە جۆری ڕستەکە.

**لە ئینگلیزیدا ڕستەکان بە چوار جۆر دابەش دەکرێن.**

۱-**ڕستە هەواڵدەریەکان** **Statement Sentences:**

ئەم ڕستانە دابەش دەبن بە دوو جۆر:

*a**هەواڵی ئەرێ*** *Affirmative Statement*

*b**هەواڵی نەرێ*** *Negative Statement*

٢-ڕستە پرسیاریەکان Interrogative Sentences: کە بریتین لە:

*a- Interrogative starting with auxiliary verbs.*

a-ڕستە پرسیارەیەکان کە بە فرمانی یاریدەدەر دەست پێدەکەن.

***b- Interrogative starting with question words.***

b--ڕستە پرسیارەیەکان کە بە وشەکانی پرس دەست پێدەکەن.

**٣-ڕستە فرماندەرەکان Imperative Sentences:**

**٤-ڕستە سەرسوڕهێنەرەکان Exclamatory Sentences:**

*بۆ ئەوەی ڕستەیەکی ڕاستەوخۆی هەواڵدەربکەینە ڕستەی ناڕاستەوخۆ پێویستە ئەو خاڵانە لەبەرچاو بگرین:

١-نیشانە (,) بەدوای قسەگێڕەوە بەکار ناهێنرێ و بەدوای ئەودا لە وشەی پەیوەندی that کەڵك وەربگرین.(دەتوانین بەکاری نەهێنین بەپێی خواستی قسەگێڕەوە)

٢-دەمی ڕستە ڕاستەوخۆکە، بۆ ڕستەی ناڕاستەوخۆ دەمێك دەبەینە دواوەو نیشانە (" ")ی لادەبەین.

٣-جێناو بکەریەکان، ناوەڵناوە خاوەنداریەکان، جێناوە کارلێکراوەکانو هێندێك لە ناوەڵفرمانەکان ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت کە بە وردی باسیان لێوە دەکەین.

لێرەدا نموونەیەك لە گۆڕینی ڕستەی ڕاستەوخۆ بۆ نارستەوخۆ هاتووە.

She says, " I work hard."

ئەو دەڵێ من بە قورسی کار دەکەم.(ڕاستەوخۆ)

She says that she works hard.

ئەو دەڵێ من بە قورسی کار دەکەم.(ناڕاستەوخۆ)

*هەروەك دەبینرێ ئاڵوگۆڕ بەسەر مانای ڕستەکەدا نەهاتووە.

بۆ زانیاری زیاتر بۆ هەرکام لە دەمەکان نموونەیەك باس دەکەینو نیشانی دەدەین دەمی ڕستەی ڕاستەخۆ لە ڕستە ناڕاستەوخۆکەدا دەبێتە چ دەمێك.

*دەمی ئێستای سادە:* He said, " We play football once a week."

ئەو وتی ئێمە حەوتووی جارێك یاری فوتباڵمان دەکرد.

*دەمی ڕابردووی سادە:* He said, he said that they played football once a week

*دەمی ڕابردووی سادە:* She said," I bought a dress yesterday."

ئەو وتی من دوێنێ کراسێکم کڕی.

*دەمی ڕابردووی دوور:* She said that I had bought a dress the day before.

He said, " I am reading a book now. " :دەمی ئێستای سادەی بەردەوام

ئەو وتی من خەریکی خوێندنەوەی کتێبێکم ئێستا.

He said, He said that he was reading a book then. :دەمی سادەی رابردووی بەردەوام

They said, " We were watching TV? " :دەمی رابردووی سادەی بەردەوام

ئەوان وتیان ئێمە خەریك بووین چاومان لە تەلەفزیۆن دەكرد.

They said that they had been watching TV. :دەمی رابردووی دووری بەردەوام

*بۆ ئەم دەمە دەتوانین هەر لە دەمی رابردووی سادەی بەردەوام کەڵك وەربگرین.

The said that they were watching TV.

He said, " I have spoken English all my life." :ئێستای تەواو

ئەو وتی هەموو ژیانم ئینگلیزی قسەم کردووە.

They said that he had spoken English all his life. :رابردووی دوور

They said, " We had gone out when she came here " :رابردووی دوور

ئەوان وتیان ئێمە رۆیشتیبووینە دەرێ کاتێك ئەو هات بۆ ئێرە.

They said that they had gone out when she had come here. :رابردووی دوور

*هەروەك دەبینرێ لەم رستەیەدا بەشی یەکەمی رستەکە کە رابردووی دوورە وەك خۆی

...مێنێتەوە بەڵام بەشی دووەم کە رابردووی سادەیە ئەویش دەبێتە رابردووی دوور.

Layla said, " He will give me the book tomorrow." :داهاتووی سادە

لەیلا وتی ئەو بەیانی کتێبەکەم دەداتێ.

Layla said that he would give me the book the next day. :...ی سادە لە رابردوودا

They said, " Mr. liz will have come here by five o'clock. "

داهاتووی تەواو :

ئەوان وتیان بەرێز لیز بۆ سەعات ٥ دێتە ئێرە (تا سەعات ٥ لێرەیە)

داهاتووی تەواو لە رابردوودا:

They said that Mr. liz would have come there by five o'clock.

*هەروەك دەبینرێ لەهەموو ڕستەکان ئەو شتانەی کە ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتووە لەژێریان خەت کێشراوە (دیاری کراوە).

هەرکات ڕستەکە ئاماژە بە ڕاستەیەکی هەمیشەیی و بەردەوام بکات هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا نایە.

They said,“ Kurdistan is a beautiful homeland.”

ئەوان وتیان کوردستان نیشتمانێکی جوانە.

They said that Kurdistan is a beautiful homeland.

*بەگشتی ئەو ئاڵوگۆڕانە لە گۆڕینی ڕستەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ ناڕاستەوخۆ دەکرێن بریتین لە:

جێناوەکان بەو شێوەیە دەگۆڕدرێن.

*(جێناوی بکەری)*

| | |
|---|---|
| I → | he, she |
| We → | they |
| They → | they |

| | |
|---|---|
| I → | he, she |
| We → | they |
| They → | they |

*( جێناوی کارلێکراو):*

| | |
|---|---|
| me → | him, her |
| you → | them |
| us → | them |

| | |
|---|---|
| me → | him, her |
| you → | them |
| us → | them |

*هەرکات قسەگێڕەوەو بکەر یەکێك بوون I, we ئاڵوگۆڕیان بەسەردا نایە.

وەکوو:

We said, “ We come home.” وتمان ئێمە دێینە ماڵێ.

We said that we went home. وتمان ئێمە دێینە ماڵێ.

*هەرکات مەبەست لە me ئەو کەسە بێت قسە دەگێڕێتەوە لە ڕستە ناڕاستەوخۆکاندا ناگۆڕدرێ، you لە دۆخی تاك دا هەرکات بە کەسێکیتر ئاماژە بکات دەبێتە him, her.

I said, “ He gave me a book.” من وتم ئەو کتێبێکی پێدام.

I said that he had given me a book. من وتم ئەو کتێبێکی پێدام.

ana said to Gzing,“ I will take you to picnic.”

زانا بە گزینگی وت دەت بەم بۆ سەیران.

Zana said to Gzing that he would take her to picnic.

***ئاڵوگۆڕی ناوەڵناوی خاوەنداریەتی:***

| | |
|---|---|
| my → | his, her |
| you → | his, her |
| our → | their |

*هەرکات قسەگێڕەوەو بکەر یەکێك بێت my ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت.

***ئاڵوگۆڕەکانی جێناوی خاوەنداریەتی:***

| | |
|---|---|
| Mine → | his, hers |
| yours → | his, hers |
| ours → | theirs |

*ئەو وشانەی خوارەوە لەکاتی گۆڕینی ڕستەی ڕاستەوخۆ بۆ ناڕاستەوخۆ بەو شێوازە ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت.

*this* → *that*
*these* → *those*
*now* → *then*
*here* → *there*
*ago* → *before*

yesterday → the day before = the previous day
last night → the night before = the previous night
last week → the week before = the previous week
tomorrow → the next day = the following day
tomorrow night → the next night = the following night
next year → the next year = the following year

***come*** → ***go***
***bring*** → ***take***
***today*** → ***that day***

**خاڵێکی گرینگ:**

زۆر لە ئاڵوگۆڕەکانی جێناوی بکەری، جێناوی کارلێکراوی، ناوەڵناوی خاوەنداریەتی ،دندیان بە بۆچوونی قسەکەرەوە هەیە، یانی بەشێوەیەك دەبێ ئاڵوگۆڕەکان بکرێ کە گرفت لە مانای ڕستەکەدا دروست ناکات. وەك:

The teacher said to me,‘‘ Prshng you must bring your books.’’
The teacher told me that I had to bring my books.

مامۆستاکە پێی وتم تۆ دەبێ کتێبەکانت بێنی بۆ قوتابخانە.

*هەروەك لەو ڕستانەی پێشەوە هاتووە (پرشنگ) باس لەوە دەکا کە مامۆستاکەی پێی وتووە دەبێ کتێبەکانی بەرێ بۆ قوتابخانە وەك دەبینرێ لەجێگای پرشنگ Prshng جێناوی بکەری I بەکار هاتووە وە you هەڵگیراوە، هەروەها لەجێگای ناوەڵناوی خاوەنداریەتی my, your بەکار هاتووە.

**ڕستە فرماندەرەکان چۆن بکەینە ناراستەوخۆ:**

هەرکات بمانەوێ ڕستە ڕاستەوخۆ فرماندەرەکان بکەینە ناراستەوخۆ پێویستە ئەم ئاڵوگۆڕانەی ژێرەوەی تێدا بەکار بێنین.

١-فرمانی قسەگێڕەوە دەبێ بکەینە order- ask (فرمان دان، داخواز بوون) – یان command.

*بەڵام هەرکات فرمانی ڕاستەوخۆ بەو وشانەی وەك please یان would you کە بە مانای (تکایە) بەکار دەهێنرێ فرمانی قسەگێڕەوە دەبێتە ask بەڵام هەرکات بەشێوەی فرمان دان بەکار بێت بۆ ڕستە ناراستەوخۆکان لە command, order کەڵك وەردەگرین.

٢-فرمانی داخوازیەکە دەبێتە چاوگ بەمەرجێ نەرێ بێت.

٣-هەرکات فرمانی داخوازیەکە نەرێ negative بێ دەبێتە چاوگی نەرێ.

He said,‘‘ Open the door please.’’ ئەو وتی تکایە درگاکە بکەوە.

He asked me to open the door. ئەو وتی تکایە درگاکە بکەوە.

He said,‘‘ Go.’’ ئەو پێی وتم برۆ.

He ordered me to go. ئەو پێی وتم برۆ.

She said, ‘‘Don’t go.’’ ئەو پێی وتم مەڕۆ.

She asked me not to go. ئەو پێی وتم مەڕۆ.

***گۆڕینی ڕستە پرسیاریەکانی ڕاستەوخۆ بۆ ناراستەوخۆ:***

**a) گۆڕینی ڕستە پرسیاریەکان کە بە یەکێك لە فرمانە یاریدەدەرەکان بوونە پرسیاری.**

بۆ گۆڕینی ئەو جۆرە ڕستانە ئەو خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو دەگرین:

**١-فرمانی قسەگێڕەوە (ask) ە.**

**٢-وشەی that لادەچێو ڕستەکە بە if یان whether دەست پێدەکات.**

**٣-فۆرمی پرسیارەکە دەبێتە هەواڵیو نیشانە پرسیار"؟" لادەچێ.**

She said to me,'' Have you even read this book?''

پێی وتم "ئایا تا ئێستا ئەم کتێبەت خوێندۆتەوە؟".

She asked if I had read that book.

He said to his wife,'' Do you love me?''

لە خێزانەکەی پرسی ئایا خۆشت دەوێم.

He asked his wife if she loved him.

**b)ئەو رستە پرسیاریانەی کە بە وشەکانی پرس، پرسیاری کراون و بۆ گۆڕینیان بۆ ناراستەوخۆ ئەو ئاڵوگۆڕانەیان تێدا پێک دێ.**

١-فرمانی قسەگێڕەوە (ask)ە.

٢-وشەی that لادەچێ.

٣-فۆرمی پرسیاری دەبێتە هەواڵی و نیشانە (؟) لادەچێ. وەك:

He said to her,'' Where do you go?''

ئەو لێی پرسی بۆکوێ دەچی.

He asked her were she went.

They said,'' What do you do?''

لێیان پرسیم چی دەکەی.

They asked what I did.

**گۆڕینی رستە سەرسوڕهێنەرەکان لە ڕاستەوخۆوە بۆ ناراستەوخۆ:**

ئەو رستە سەرسوڕێنانە کە بە وشەکانی what, what an, what a کە بە مانای (چ سەیر،چ) بەکار دەهێنرێن بە دوایاندا هەموو کات ناو یان ناوی هاوڕێ لەگەڵ ئاوەڵناو دێت و شێوەی رستە بەدوایاندا هەموو کات هەواڵی ئەرێیە. وەك:

What a beautiful girl she is! چ کچێکی جوانە!

What dreadful man I saw! چ پیاوێکی ترسێنەرم دی !

*هەروەها ئەم رستانە بە how دەست پێدەکەن و بەدوایدا تەنیا ئاوەڵناو بەکار دەهێنرێ و بەکارهێنانی ناو هەڵەیە.

How hungry I am! چەند برسیمە!

**بۆ گۆڕینی ئەم جۆرە رستانە بۆ ناراستەوخۆ دوو شێوە بەکار دێنین.**

A) دەتوانین بە یارمەتی فرمانی to be بەپێی دەمی رستەکە بیکەینە رستەی هەواڵی و وشەی what لابەرین. وەك:

He said," What dreadful man I saw!"

ئەو وتی چ پیاوێکی ترسینەرم دی.

He said that he had seen dreadful man.

B) دەتوانین بەو شێوەی خوارەوەیش بەکاری بێنین.

He said what dreadful man he had seen.

*لەوانەیە لە رستە سەرسورینەکان دا ئاماژە بە بکەر بکرێ لەو دۆخانەدا رستەکە بەشێوەی ئەرێ بەکار دەهێنرێن و لە فۆرمی پرسیاری و ئەرێ کەڵك وەرناگرین.

What blue eyes she has! چاوی چەن شینە!

He said," What blue eyes she has! " ئەو وتی چ چاوانێکی شینی هەیە.

He said that she had blue eyes.

**چۆنیەتی بەکارهێنانی فرمانی یاریدەدەری must لە رستەی راستەوخۆو ناراستەوخۆ:**

هەروەك دەزانین must فرمانێکی ناتەواوەو بۆ رابردووەکەی پێویستە لە had to کەڵك وەربگرین لە قسەگێرانەوەی ناراستەوخۆدا هەر بەو شێوەیە بەکار دەهێنرێ بەڵام پێویستە بە تەواوی سەرنج دەینە ئاوەڵفرمانی کات چونکە ئەگەر رستەکە ئاوەڵفرمانی کاتی دەمی ئێستای هەبێ دەبێتە had to بەڵام ئەگەر ئاوەڵفرمانی داهاتووی هەبێ must دەبێتە would have to . وەکوو:

She said," I ***must*** go ***now***."

ئەو وتی دەبێ ئێستا دەبێ برۆم.

She said that she ***had*** to go ***then***.

She said," I ***must*** come back ***tomorrow***."

ئەو وتی سبەینێ دەبێ بگەڕێمەوە.

She said that she ***would have to*** come back ***the following day***.

**سەرنج:**

هەرکات must لە دۆخی قەدەغە کردن دا بەشێوەی ئەرێ بەکار بهێنرێ لە گۆڕینی بۆ ناراستەوخۆ must ناگۆڕدرێ. وەك:

He said to us," You must not smoke cigarette."

ئەو وتی ئێمە نابێ جگەرە بکێشین.

He told us that we must not smoke cigarette.

**Shall لە قسەگێڕانەوەی ناراستەوخۆدا:**

Shall لە ڕستە ناراستەوخۆکاندا دەبێتە would یان should بەڵام دەبێ سەرنج بدەینە ئەوو خاڵی گرینگ:

Shall لە داهاتووی ڕاستەقینەدا (real future) لەرستە ناراستەوخۆکان دا دەبێتە would.

He said,‘‘ Shall I ever forget her?’’

ئەو وتی ئایا هیچ کات لەبیری دەکەم؟

He asked himself if would ever forget her.

***هەرکات shall لە فۆرمی داخوازیدا Request یان تکا کردن بۆ بەرێوەبردنی کارێک بەکار بهێنرێ، لە ناراستەوخۆدا دەبێتە should.**

She said, ‘‘ Shall I open the window?’’

ئەو وتی ئایا دەتوانم پەنجەرەکە بکەمەوە؟

She asked if she should open the window.

***وشەکانی would, should, ought to, could, used to, might, had better, would rather لە ڕستە ناراستەوخۆکان دا ناگۆڕدرێن.**

He said,‘‘ I would help him if I could.’’

ئەو وتی ئەگەر بتوانیایە یارمەتیم دەدا.

He said that he would help him if he could.

**گۆڕینی هێندێک لە زاراوە کرداریەکان لە قسەگێڕانەوەی ناراستەوخۆدا:**

He said,‘‘ Hello.’’ ⟶ He greeted. ١. سڵاوی کرد.

He said,‘‘ Thankyou.’’ ⟶ He thankyou me. ٢. سپاسی منی کرد.

He said,‘‘ Good morning’’ ⟶ He wished me good morning.

٣. بەیانی باشی پێ وتم.

She said,‘‘ Liar.’’ ⟶ She called me a liar. ٤. پێی وتم درۆزن.

**yes, no : لە قسەگێڕانەوەی ناراستەوخۆدا:**

yes, no لە ڕستە ناراستەوخۆکاندا دەبنە بکەرو فرمانی یاریدەدەری دەمی تایبەت بەکە وەردەگرن. وەك:

He said,‘‘ Can you speak English?’’and I said, ‘‘ Yes.’’

ئەو وتی دەتوانی ئینگلیزی قسە بکەی؟ من وتم بەڵێ.

He asked if I could speak English and I said I could.

She said,'' Does Azad buy a car?''and I said, '' No.''

ئەو وتی ئایا ئازاد ئوتومبیلێك دەکڕێ من وتم نەخێر.

She asked if Azad bought a car I said he didn't .

**لە ڕستە ناڕاستەوخۆکاندا: *Let***

Let بە سێ جۆر لە ڕستە ناڕاستەوخۆکاندا بەکار دەهێنرێ.

١-چونکە ئەم فرمانە زیاتر پێشنیارە بۆ گۆڕینی بۆ ڕستەی ناڕاستەوخۆ لە فرمانی suggest و پاشان لەناوی چاوگ gerund کەڵك وەردەگرین.

He said,'' Let's sit here.''

ئەو وتی با لێرە دانیشین.

He suggested sitting there.

***دەتوانین لە should کەڵك وەربگرین وەك ئەو نموونەی ژێرەوە.**

He suggested that we should sit there.

٢-هەرکات let مانای ئیزن دان بدات وەك ڕستەیەکی فرماندان لە ناڕاستەوخۆدا دەبێتە چاوگ. وەك:

He said,'' Let her go, Ali.''

وتی عەلی ئیزنی ئەو بدە با بڕوات.

He asked Ali to let her go.

٣-let هێندێك جار بەمانای بڕیار ئامۆژگاری بەکار دەهێنرێ لەم دۆخەدا کاتی گۆڕینی لە ڕستەی ڕاستەوخۆوە بۆ ناڕاستەوخۆ لە that و فرمانی یاریدەدەری should یان to be able to کەڵك وەردەگرین.

The teacher said,'' Let no one go out:''

The teacher said that no one should go out.

The teacher said that no one was able to go out.

مامۆستاکە وتی هیچ کەسی نابێ بچێتە دەرێ.

***لە قسەگێڕانەوەی ناڕاستەوخۆدا هێندێك جار دەتوانین فرمانی قسەگێڕەوە بەو شێوەی خوارەوە بگۆڕین. وەك:**

He said to me,'' I like hunting and fishing.''

ئەو وتی من ڕاوکردن و ماسی گرتنم پێخۆشە.

He told me that he liked hunting and fishing.

He talked to me about hunting and fishing.

ئەو لەبارەی ماسی گرتن و ڕاوکردنەوە قسەی لەگەڵدا کردم.

He answered,“ I play soccer.”

ئەو وەڵامی داوە کە یاری فوتباڵ دەکات.

He answered that he played soccer.

## :it takes, it took, it will take شێوەی بەکارهێنانی

فرمانی take لە زمانی ئینگلیزیدا لەگەڵ جێناوی it بۆ پیشاندانی ماوەی تەواوی بەرێوەچوونی کارێك لە دەمەکانی (ئێستا، ڕابردوو، داهاتوو) بەکار دەهێنرێ. وەك:

It takes her a long time to make up her mind.

ماوەیەکی درێژ دەبات هەتا بڕیار بدات.

It took her a long time to make up her mind.

ماوەیەکی درێژی کێشا هەتا بڕیاری دا.

It will take us a long time to buy a new car.

ماوەیەکی درێژ دەبات بۆ ئێمە هەتا ئوتومبیلێکی نوێ بکڕین.

How long does it take her to make up her mind?

چەند کات دەبات هەتا ئەو بڕیار بدات؟

How long did it take you to read this book?

چەندە کاتی برد هەتا ئەم کتێبەت خوێندەوە؟

How long will it take them to buy a new car?

چەندە کات دەبات هەتا ئوتومبیلێکی نوێ بکڕن؟

## :Numbers ژمارەکان

لەم بەشەدا بەکورتی ئاماژەیەك بە ژمارەکان دەکەین.

ژمارەی سفر (٠) لەئینگلیزیدا پێی دەڵێن zero . بەڵام لە قسەکردن دا کاتی وتنی ژمارە تەلەفون یان ژمارە حیساب '0' یا (ئۆ) دەوترێ لە ئینگلیزی بریتانیاییدا هێندێك جار nought ی پێ دەڵێن.

لێرەدا چەند ژمارەیەك دەنووسین:

| | | |
|---|---|---|
| 1. one | 11- eleven | 21- twenty one |
| 2- tow | 12- twelve | 22- twenty two |
| 3- three | 13- thirteen | 30- thirty |
| 4- four | 14- fourteen | 31- thirty one |
| 5- five | 15- fifteen | 40- fourty |
| 6- six | 16- sixteen | 42- fourty two |
| 7- seven | 17- seventeen | 50- fifty |
| 8- eight | 18- eighteen | 60- sixty |
| 9- nine | 19- nineteen | 70- seventy |
| 10- ten | 20- twenty | 80- eighty |
| | | 90- ninety |
| | | 100- hundred |

*تا ئێرە بە کورتی چەند ژمارەیەك لە یەك تا سەدمان نووسیوە بۆ ژمارەکانی سەرەوەی سەد بڕواننە ئەو نموونانەی خوارەوە.

329. three hundred and twenty nine.

*هێندێك جار ئەمریکایەکان and بەکار ناهێنن.

1100 one thousand one hundred.

(eleven hundred) بەکەمی بەکار دەهێنرێ.

2500 two thousand five hundred.

(Twenty five hundred) بەکەمی بەکار دەهێنرێ تەنیا لە ئەمریکا.

33.423 (thirty three thousand four hundred and twenty three.

2.768.942 (two million seven hundred and sixty eight thousand nine hundred forty one)

**ئایا بۆ ژمارەکان <u>a</u> یان <u>one</u> بەکار دێنین.**

130. a hundred and thirty.

One hundred and thirty.

وشەی one و a بەو شێوانە لەپێش ژمارەکانەوە بەکار دەهێنرێن:

١- one لە نرخەکاندا بەمەرجێ تەکیدی لەسەر بکات. وەك:

It cost about one hundred and sixty three pounds exactly.

کتێبەکە رێك ١٦٣ پۆند قیمەتی بوو.

It cost about a hundred fifty pounds.

ئەو دەوری ١٥٠پۆندێك قیمەتی بوو.

٢ - a لەگەڵ دەست پێکردنی ژمارەکان بەکار دەهێنرێ(مەبەست ژمارە رێکەکانە- ١٠٠-١٠٠٠)

وەك:

100 a hundred

2100 two thousand and one hundred.

**خاڵێکی گرینگ:**

دەتوانین لەجێگای a ، one بەکار بێنین بەڵام ناکرێ لەجێگای a, one بەکار بێنین.

٣-لە a ناتوانین لەنێوان 1100 هەتا 1999 کەڵك وەرگرین.

1099 a (one) thousand and ninety nine.

1100 one thousand one hundred.

1340 one thousand three hundred and forty.

## ژمارە ریز کراوەکان یان وەسف کراوەکان :Ordinal Numbers

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| $1^{st}$ | first | یەکەم | $33^{rd}$ | thirty- third | سی‌و سێیەم |
| $2^{nd}$ | second | دووەم | $45^{th}$ | fourty- fourth | چل‌و پێنجەم |
| $3^{rd}$ | third | سێیەم | $58^{th}$ | fifty- eighth | پەنجاو هەشتەم |
| $4^{th}$ | fourth | چوارەم | $69^{th}$ | sixty- ninth | شەست‌و نۆهەم |
| $5^{th}$ | fifth | پێنجەم | $70^{th}$ | seventieth | حەفتاهەمین |
| $9^{th}$ | ninth | نۆهەم | $60^{th}$ | sixtieth | شەستەمین |
| $12^{th}$ | twelfth | دوانزەهەم | $50^{th}$ | fiftieth | پەنجاهەمین |
| $21^{st}$ | twenty- first | بیست‌ویەکەم | $50^{th}$ | hundredth | سەدەم |
| | | | $1000^{th}$ | thousandth | هەزارم |

**ئەم ژمارە وەسف کراوانە کاتێك بەکار دەهێنرێن کە:**

١-باس لە رێککەوتەکان دەکەین. وەك:

Today is thirteen October.

ئەمرۆ سیزدەی ئوکتوبر(تشرینی یەکەم)ە.

He came here on may twenty sixth.

ئەو بیست‌و شەشەمی مانگی مەی (ئایار) هات بۆ ئێرە.

*هەروەك لەسەرەوە هاتووە دەتوانین لەجێگای نووسین بە وشە لە ژمارەو دوو پیتی ئۆتایی وشەکە کەڵك وەرگرین.

Today is $5^{th}$ march.

ئەمرۆ پێنجەمی مانگی مارس (ئازار)ە.

٢-بۆ ژمارەکردنی ئەو جارانەی کە کارێك ئەنجام دەدرێ. وەك:

I was the second in my family to go to college.

من دووەمین کەس بووم لە بنەماڵەکەم کە چووم بۆ کۆلێژ.

***لەم حاڵەتەدا لەپێشیان دا لە ئامرازی ناساندنی دیار (the) کەڵک وەردەگرین.**

٣-بۆ ژمارەکردنی کەسەکان یان شتەکان. وەك:

His first wife's name was berevan. یەکەمین خێزانی ئەو ناوی بیریڤان بوو.

**نوسین و وتنی ڕێکەوتەکان Writing and Saying Dates:**

لە زمانی ئینگلیزیدا ساڵەکان بەو شێوەیە دەخوێندرێنەوە.

1999 nineteen ninety- nine. ساڵی هەزارو نۆسەدو نەوەدو نۆ

1700. seventeen hundred ساڵی هەزارو حەوت سەد

1608 . sixteen 0 eight ساڵی هەزارو شەش سەدو هەشت

AD76= AD seventy – six (76 years after the beginning of the Christian calendar.)

CE76 = seventy – six CE (both these expressions mean)

٧٦ ساڵ کۆچی زایینی

لەو دوو حاڵەی سەرەوەدا کە لە AD- CE کەڵك وەرگیراوە بە مانای دوای لە دایك بوونی مەسیح بەکار دێنرێن دیارە هەردووکیان یەك مانایان هەیەو هەموو کاتێك پێویستە بە پیتی گەورە capital بنووسرێن.

1000 <u>BC</u> = one thousand <u>BC.</u>

1000 <u>BCE</u>= one thousand <u>BCE</u> (both these expressions mean)

(1000 years before the beginning of the christen calendar.)

*وشەکانی BC- BCE کە دەبێ هەموو کات بە پیتی گەورە بنووسرێن بەمانای پێش زایین (لە دایك بوونی مەسیح) بەکار دەهێنرێن.

لە درێژەی وتنی ڕێکەوتەکان دا ئاماژەیەکی کورت بە وتنی کاتی لە دایك بوون دەکەین :

-لە زاراوەی بریتانیاییدا زیاتر ئەو شێوازە بەکار دەهێنرێ.

His birthday is on the ninth of December.

ڕۆژی لە دایکبوونەکەی نۆهەمی دیسیمبەر(کانوونی یەکەم)ە.

His birthday was on July the ninth.

ڕۆژی لە دایکبوونەکەم نۆهەمی ژولای(تەموز)ە.

Her birthday is December 9th .

ڕۆژی لە دایکبوونەکەی نۆهەمی دیسیمبەرە.

*زۆرجار لە وتنی تەمەن دا لەو شێوەی خوارەوە کەڵك وەردەگرین.

تۆم شەش ساڵانە. Tom is six.

*ئەو شێوازەی خوارەوەیش بەکار دەهێنرێ. وەك:

She was thirty – one years old. ئەو سیو یەك ساڵ تەمەنی بوو.

* *ئەگەر کەسەکە تەمەنی لە ساڵ کەمتر بێت دەتوانین لە month, week کەڵك وەربگرین.

a ten week – old baby.

منداڵێکی دە حەوتووی (منداڵێك کە ١٠ حەوتوو تەمەنی هەیە)

--لەو وشانەش کەڵك وەردەگرین: وەکوو:

لە ساڵەکانی نێوان ١٣ هەتا ١٩ پێی دەڵێن teens

لە ٢١ هەتا ٢٩ پێی دەوترێ twenties

لە ساڵەکانی نێوان ٣١ هەتا ٣٣ پێی دەڵێن early thirties

لە ساڵەکانی نێوان ٣٤ هەتا ٣٦ پێی دەڵێن mid thirties

لە ساڵەکانی نێوان ٣٧ هەتا ٣٩ پێی دەڵێن late thirties

## ژمارەکان لە کات دا Number in Time

لە ئینگلیزیدا کاتەکان بەو شێوانەی خوارەوە بەیان دەکرێن:

6:30. six thirty = half past six شەش و نیو

6:45 sixty fourty five = a quarter to seven

شەو چل و پێنج خولەکە (چارەك بۆ حەوت)

1:10 . one ten = ten past one یەك و دە خولەك (دەقیقە)

*وشەی o'clock تەنیا بۆ کاتە تەواوەکان (ڕێکەکان) بەکار دەهێنرێ . وەك:

سەعات سێیە. (سێی تەواو) It's three o'clock.

زۆرجار لەکاتی بەیان کردنی کاتەکاندا لە (a . m.) کەڵك وەردەگرن.

(a . m.) سەعات یەکی نیوەشەوەوە هەتا دوازدەی نیوەڕۆ بەکار دەهێنرێ کە کورت کراوەی وشەی ( . ante. meridian )ە و هەروەها (p. m.) لە دوانیوەڕۆوە هەتا نیوەشەو بەکار دەهێنرێ و کورت کراوەی (post meridian) ە. وەکوو:

He gets up at 6 a.m. everyday.

ئەو هەموو رۆژێ سەعاتی شەشی بەیانی هەڵدەستی.

I'll see you at 8 p.m. this evening.

من سەعات هەشتی دوانیوەڕۆ دەت بینم.

**سەرنج:**

**بەدوای (a.m.) و (p. m.)نابێ لە o'clock کەڵك وەرگرین.**

***ژمارە تەلەفونەکان* Telephone Numbers :**

بەو شێوەی خوارەوە دەخوێندرێتەوە.

550674. (five five o six seven four)

دەتوانین لەجێگای دووجار five – five double بەکار بێنین.

## نیشانەکان Marks:

*لێرەدا بە کورتی ئاماژە بەو نیشانانە دەکەین کە لە ئینگلیزیدا بەکار دەهێنرێن.*

| | | |
|---|---|---|
| نیشانەی سەرسوڕمان | exclamation | ! |
| هێڵ | dash | – |
| بۆشایی | dots / ellipsis | |
| کەوانە | brackets / paretheses | ( ) |
| هێڵی لار | slash / oblique | / |
| نیشانەی پرسیار | question mark | ? |
| کۆما "فاریزە" | comma | |
| خاڵ و فاریزە | semicolon | ; |
| کریشە | square brakets | [ ] |

## بیست و پێنج خاڵی گرینگی ڕێزمانی
## 25 Important Grammatical Points

**١-لە نووسینی ئینگلیزیدا فرمانی depend پێویستی بە on یان upon وە هەیە دیارە زیاتر لە on کەڵك وەردەگیرێ. وەك:**

پێوەندی بەهاتنی ئەوەوە هەیە هەتا ئێمە بڕۆین. ( ڕۆیشتنی ئێمە پێوەندی بە هاتنی ئەوەوە هەیە)

It depends on his coming to we go.

**٢-هەروەك لە باسی قسەگێڕانەوەی ڕاستەوخۆدا باسمان کرد وشەکانی if یان whether لە گۆڕینی قسەگێڕانەوەی ڕاستەوخۆ بۆ ناڕاستەوخۆ لە ڕستە پرسیاریەکان دا بەکار دەهێنرێن و ڕستەکە لە حاڵەتی پرسیاری دەردێنن.وەکوو:**

She asked if (whether) I wanted a drink.

لێی پرسیم ئایا خواردنەوەیەکم دەوێ.

*ئەو جیاوازیەی لەنێوان ئەم دوو وشەیەدا هەیە ئەوەیە کە whether زیاتر لەگەڵ فرمانەکانی وەك discuss, decide, consider بەکار دەهێنرێ.و کاتێك کە هەڵبژاردن لەنێوان دوو ڕێگا چارە لە ڕستەیەك دا بێت لەنێوان ئەو دوو وشەیەدا whether بەکار دێنین هەرچەند ئەگەر if یش بەکار بێنین ڕستەکەمان هەڵە نابێ و هەروەها whether لە نووسین دا زۆرتر بەکار دەهێنرێ. وەك:

He didn’t know whether we should write or phone.

ئەو نەی دەزانی ئایا ئێمە دەبێ (نامەی) بۆ بنووسین یاخود تەلەفونی بۆ بکەین

**٣-وشەکانی (sort, kind) یان (sorts, kinds) کە بەشێوەی تاك و کۆ بەکار دەهێنرێن پێوەندیان بەو وشانەوە هەیە کە لە گەڵیان دا بەکار دەهێنرێن.وەکوو:**

Each / one / every kind animal.

All / many / other sorts of animal.

*هەروەك دەبینرێ وشەکانی every, one, each بەشێوەی تاك بەکار دێن و بەدوایان دا kind ئەویش هەر بەشێوەی تاك هاتووە.

بەڵام وشەکانی all, many, other کە بەشێوەی کۆ بەکار دێنرێن یش sort، sorts بەکار هێنراوە.

ئەم وشانە دەتوانین لەگەڵ ئەو ناوانەی ناژمێردێن بەشێوەی تاك بەکار بێنین.

That sort of behaviour isn’t acceptable. ئەو جۆرە هەڵسوکەوتە باش نیە.

٤-فرمانی sit کە مانای دانیشتن دەدات دەتوانین لەگەڵ هەردوو زێدەوازەی on, in بەو شێوەیە بەکاری بێنین.

You sit on a chair (or step – or edge of the table)

تۆ لەسەر کورسیەك دانیشتووی (یان قادرمە، یان قەراغی مێزێك)

You sit in an armchair. ئەو لەنێو کورسیەکەدا (کورسی دەسکدار)دا دانیشتووە.

_ هەرکات in بەکار بێت نیشاندەری ئەوەیە بە تەواوی لەناو جێگاکەدا جێی گرتووە یان بە واتایەکی‌تر دەوری گیراوە لوەك کورسیەکانی شوێنی نان خواردن).

٥-لەپێش وشەی abroad دا هیچ کات لە زێدەوازە کەڵك وەرناگرین.

He worked abroad for a year. بۆ ماوەی ساڵێك لە دەرەوە کاری کرد.

He was famous, both at home and abroad.

ئەو هەم لە ناوەوەو هەم لە دەرەوە ناسراوبوو. (ئەو لە ناوەوەو لە دەرەوەیش ناسراو بوو)

٦-بەدوای فرمانی enjoyدا هیچ کات لە زێدەوازە کەڵك وەرناگرین. وەك:

I enjoy playing tennis. من لە یاری کردنی تینس چێژ وەردەگرم.

I hope you enjoy your trip. هیوادارم لە سەفەرەکەت چێژ وەرگری.

*هەرکات بەدوای enjoy دا جێناوی پێچەوانە بەکار بێت لەگەڵ have a good time بەرانبەرە. وەکوو:

I enjoyed myself at the party. من لە میوانی کاتێکی خۆشم بەسەر برد.

٧-چۆنیەتی بەکارهێنانی **arise, raise, rise** :

***rise*** بە مانای چوونە سەرێ، سەرکەوتن، هەڵاتن یان دەرهاتن بۆ (خۆر) بەکار دە فرمانێکی تێنەپەڕە یانی پێویستی بە کارلێکراو نیە دەمی رابردووەکە rose و ناوی کارلێکراوەکەی (risen)ە. وەك:

The sun rises in the east. خۆر لە خۆرهەڵاتەوە دێتە دەرێ. (هەڵدێ)

Costs are always rising. نرخەکان هەموو کاتێ لە حاڵی چوونە سەرێ دان.

***Raise*** : بە واتای (هەڵێنان، هێنانە سەرێ) فرمانێکی تێپەڕە (پێویستی بە کارلێکراو هەیە) ئەم فرمانە یاسایی‌یە لە دەمی رابردوو و ناوی کارلێکراودا وەردەگرێ. وەك:

She raised her eyes and looked at me.

چاوەکانی هەڵێناو سەیری منی کرد.

<u>*Arise*</u>: بە مانای (ڕوودان، بەسەر هاتن) ڕابردووەکەی arose ناوی کارلێکراوەکەی (arisen)ە . وەکوو:

What has new difficult arisen? — چ کێشەیەکی نوێ ڕووی داوە؟

## ٨-شێوەی بەکارهێنانی depth, width, length, height :

| ناو | ئاوەڵناو |
|---|---|
| depth | بەمانای (قووڵ) — ئاوەڵناوەکەی (deep) ە . |
| width | بەمانای (پانی) — ئاوەڵناوەکەی (wide) ە . |
| length | بەمانای (درێژی) — ئاوەڵناوەکەی (long) ە . |
| height | بەمانای (بەرزی) — ئاوەڵناوەکەی (high) ە . |

**شێوەی بەکارهێنانیان لە ڕستەدا بەو شێوەیە.**

What is the <u>depth</u> of the water here? — قوڵایی ئاوەکە لێرە چەندە؟

He is so <u>deep</u> in his books that he forgets to eat.

ئەو وا دەچێتە قوڵایی کتێبەکانیەوە لە بیری دەچێ نان بخوات. (مەبەست قوڵایی کتێب خوێندنەوەیە)

She took a <u>deep</u> breath. — ئەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

The <u>height</u> of the mountain didn't discourage them.

بەرزی کێوەکە دڵساردی نەکردنەوە.

How <u>high</u> is Everest? — ئێوێرێست چەندە بەرزە؟

Did you see the <u>length</u> of her hair? — ئایا درێژی قژی ئەوت دی؟

She had <u>long</u> dark hair. — ئەو قژێکی ڕەشی درێژی بوو.

It's about 10 metres in <u>width</u>. — ئەو پانیەکەی نزیکەی ١٠ میترە.

it's about 10 metres <u>wide</u>. — ئەو ١٠ میترە پانە.

**٩-لەپێش وشەکانی an, a, much, many هیچ کات نابێ لە no کەڵك وەرگرین بەڵام لەجێگای ئەو not بەکار دێنین.**

Not many books he reads. — کتێبی زۆر ناخوێنیتەوە.

Not much news we got. — هەواڵێکی زۆرمان بەدەست نەهێنا.

Not a person spoke to me. — هیچ کەس قسەی لە گەڵمدانەکرد.

Not an apple we ate. — هیچ سێوێکمان نەخوارد.

١٠-بەدوای فرمانەکانی expect, think, suppose, hope, be afraid, believe هیچ کات لە no کەڵك وەرناگرین بەڵکوو not بەکار دێنین. وەکوو:

Will she be there? -- I hope not.

ئایا ئەو لەوێ دەبێ؟ هیوادارم نەبێ (لەوێ نەبێ)

Is it ready? --- I am afraid not.

ئایا ئامادەیە؟ بە داخەوە نا (ئامادە نیە)

Does he know? -- I believe not.

ئایا ئەو دەزانێ؟ پێم وانیە (بڕوا ناکەم بزانێ)

١١-وشەکانی sometime, somewhat, somehow بەو شێوازانەی خوارەوە بەکار دەهێنرێن.

*__Somehow__*: بە مانای (بەشێوەیەک، بە جۆرێک) ئاوەڵفرمانە لە سەرەتاو کۆتایی ڕستەوە بەکار دەهێنرێ. وەك:

She talked different somehow. ئەو بە شێوەیەکی جیاواز قسەی دەکرد.

Somehow, I don't feel I can trust him.

بەجۆرێك هەست پێناکەم بتوانم بڕوای پێ بکەم.

*__Somewhat__*: بە مانای (تا ڕادەیەک) ئەویش ئاوەڵفرمانە. بە شێوەی خوارەوە بەکاردەهێنرێ.

I was somewhat surprised to see him.

تا ڕادەیەك سەرم سوڕما کە دیتم. (بینیم)

*__Sometime__*: بە مانای (کاتێک) بەکار دەهێنرێ بەڵام sometimes بە مانای (هێندێک جار) کەڵکی لێوەردەگیرێ. وەکوو:

Sometimes I go by car. هێندێك جار بە ئوتومبیل دەڕۆم.

I will speak to him about grammar sometime.

من لە دەرفەتێکدا لەبارەی ڕێزمانەوە قسەی لەگەڵدا دەکەم.

١٢-لەپێش وشەکانی home ,here و there کاتێك ئاراستەی فرمان ڕوو بەوان بێت هیچ کات لە زێدەواژەی to کەڵك وەرناگرین.

They arrived home at 9:00. ئەوان سەعاتی ٩ گەیشتنە ماڵێ.

I come there every day. من هەموو ڕۆژێ دێم بۆ ئەوێ.

She will get here tomorrow. ئەو بەیانی دەگاتە ئێرە.

١٣-لەپێش downstairs بە مانای (قاتی خوارێ) upstairs (قاتی سەرێ) هیچ کات لە زێدەواژە کەڵك وەرناگرین. وەك:

She went upstairs to get dressed.

ئەو چووە قاتی سەرێ تا جلەکانی لەبەر کات.

Wait downstairs for five minutes.

بۆ ماوەی پێنج خولەك لە قاتی خوارێ چاوەڕێ بکە.

**١٤-فرمانی lie:**

**ئەم فرمانە دوو مانای سەرەکی هەیە کە بەو شێوەی خوارەوە بەکار دەهێنرێ.**

| ماناکان | ناوی کارلێکراو | دەمی رابردوو | ناوی چاوگ |
|---|---|---|---|
| درۆ کردن، قسەی ناراست کردن | lied | lied | to ile |
| راکشان، پشوودان، خەوتن، مانەوە، هەلکەوتوو لە ... | lain | lay | to ile |

*هەروەك دەبینرێ لە راستیدا lie دوو فرمانە نەك یەك فرمان چونکە یەکێکیان یاسایی‌یە لە کۆتاییدا تەنیا d بۆ دەمی رابردوو ناوی کارلێکراو وەردەگرێ. بەڵام (lie)ە کەی دیکە فرمانێکی بێ‌یاسایەو بۆ دەمی رابردوو دەبێتە lay ناوی کارلێکراوەکەی (lain)ە.

**نموونەکان:**

These machines have lain idle since the factory closed.

لەو کاتەوە کۆمپانیاکە داخراوە ئەم ئامێرانە بێ ئیش کەوتوون.

He lied about his age.

ئەو لەبارەی تەمەنیەوە درۆی کرد.

**١٥-بەکارهێنانی bite, bit:**

**فرمانی To bite بەمانای (قەپاڵ گرتن – گاز گرتن) کە رابردووەکەی دەبیتە bit و ناوی کارلێکراوەکە دەبێتە bitten وشەی bit بە مانای (لەتکێك، تۆزێك) بەکار دەهێنرێ.**

**ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە دەمی رابردووی bite کە دەبێتە bit لەگەڵ وشەی bit بەیەك جۆر دەنووسرێ‌و دەخوێندرێتەوە لێرەدا پێویستە ئاگاداری جۆری رستەکە بین‌و بۆئەوەی لە مانا کردنەوەیان دا هەڵە نەکەین. وەك:**

It cost a bit more then I wanted to spend.

نرخی ئەو تۆزێك لەوەی کە من دەمتوانی خەرجی کەم زیاتر بوو. (لێرەدا بە مانای تۆزێك یان کەمێك)

The dog bit him last night.

دوێنێ شەو سەگەکە گازی لێ‌گرت. (لێرەدا وەك دەمی رابردووی bite بەکار هێنراوە)

**١٦-pair:** **ئەم وشەیە مانای جووت دەدات بەڵام لەگەڵ ئەو وشانەی خوارێ وەك ئاماژە کردن بە ژمارەی ئەوان بەکار دەهێنرێ.**

a pair of trousers پانتۆڵێك — a pair of glasses چاویلکەیەك
a pair of pants پانتۆڵێك — a pair of scissors مقەستێك
a pair of jeans پانتۆڵێك — a pair of binocularsدووربینێکی چاو
a pair of shoes جوتێ کەوش

**١٧-وشەی while: به مانای (کاتێك) بەکار دەهێنرێ‌و مانای بەردەوامی بە رستە دەبەخشێ بێئەوەی لە دەمە بەردەوامەکان کەڵك وەربگرین.** وەك:

While lunch he came here. کاتی نەهار (نیوەڕۆ) خواردن هات بۆ ئێرە.

**١٨-لەپاش marry: به مانای (پێکهێنانی ژیانی هاوبەش) لە رستە دیارەکان دا لە زێدەواژە کەڵك وەرناگرین. بەڵام کاتێك لە دۆخی نادیاردا بەکاری بێنین پێویستمان بە زێدەواژەی (to)ە.** وەك:

He never married. ئەو هیچ کات ژیانی هاوبەشی پێك نەهێنا.
She is married to a German. ئەو لەگەڵ ئاڵمانیەك ژیانی هاوبەش پێك دێنێ.

**١٩-بەکارهێنانی remind, remember:**

**وشەی remember بە مانای (وەبیر هێنانەوە)و بەدوای ئەودا ئەگەر کاتی رستە ئاماژە بە رابردوو بکات لە ناوی چاوگ کەڵك وەردەگرین لە حاڵێك دا remind بە مانای (هێنانەوە بیری کەسێك) فرمانێکی تێپەڕەو پێویستی بە کارلێکراو هەیە.** وەك:

I remember seeing her before. وەبیرم دێت پێشتر دیوومە.
Remind me to phone Hawar before go out.

وەبیرم بێنەوە تەلیفۆنی بۆ هاوار بکەم پێش ئەوەی بچمە دەرێ.

**٢٠-بەکارهێنانی loosen, loose:**

وشەی loose ئاوەڵناوەو بە مانای (شل، هەراو) وشەی loosen فرمانە بە مانای (شل کردن) بەکار دەهێنرێ. وەکوو:

I bought a loose pair of shoes. جووتێ کەوشی هەراوم کڕی.
Awara loosened his decision and let Shila go.

ئاوارە بڕیارەکەی شل کردەوەو ئیجازەی بە شیلا دا بڕوات.

**٢١-بەکارهێنانی tighten, tight:**

**وشەی tight ئاوەڵناوە بە مانای (تەنگ، رەق، توند) بەکار دەهێنرێ لە حاڵێك دا وشەی tighten فرمانەو بە مانای (توند کردن، رەق کردن) دێت.** وەك:

She was wearing a tight pair of leans. ئەو پانتۆڵێکی تەنگی لە پێدایە.
Please tighten this screw. تکایە ئەم پێچە توند کەوە.

**٢٢-بەکارهێنانی on the whole, the whole:**

**وشەی the whole بە مانای (تەواوی) هێما بە هەموو شتێك دەکات وەك ناوەڵناو بەکار دەهێنرێ، بەڵام on the whole بە مانای (لەسەر یەك) بەکار دەهێنرێ. وەك:**

Let's forget the whole thing. وەرە با هەموو شتێ لەبیر خۆمان بەرینەوە.

On the whole I'm in favour of the idea.

لەسەر یەك من لایەنگری بۆ چوونەکەم.

**٢٣-لەدوای وشەکانی harmful :بە مانای (زیان بەخش، خراپ) useful بە مانای (سوودمەند، قازانج) پێویستە لە زێدەواژەی to بە مانای (بۆ) کەڵك وەربگرین نەك (for).**

Fruit juices can be harmful to children's teeth. وەکوو:

شەربەتی میوەکان دەتوانن بۆ ددانی منداڵەکان زیان بەخش بن.

He might be useful to you. ئیمکانی هەیە ئەو بۆ ئێوە سوودمەند بێ.

**٢٤-سڵاو کردن greeting: لە زمانی ئینگلیزیدا لە زۆربەی حاڵەتەکاندا لە وشەی hello بۆ سڵاو کردن کەڵك وەردەگرن تەنانەت لە تەلەفونەکانیش دا بۆ یەکەمین جار لەو وشەیە کەڵك وەردەگرن کە خەڵکانی وڵاتانی دیکەیش پێرەوی لێدەکەن.**

لە سڵاوکردنی دۆستەکان دا زۆرجار دوو هاورێ یان دوو کەسی زۆر نزیك وشەی hi بەکار دێنن کە ئەم جۆرە سڵاوە زۆر هاورێیانە.

وشەی good morning کە هەر مانای بەیانیت باش یان بە واتایەکیتر هەر جۆرێك لە سڵاوکردنە وەك: hello کە زیاتر لەناو ئەندامانی بنەماڵەکان دا یان ئەو کەسانەی لە شوێنێك بەیەکەوە کار دەکەن، بەیانی هەر رۆژێك کە بۆ یەکەم جار یەکتری دەبینن بەو وشەیە سڵاو لەیەکتری دەکەن.

وشەکانی good afternoon- good evening لەکاتی دوانیوەڕۆ و ئێوارە بەکار دەهێنرێن لێرەدا پێویستە سەرنج بدەینە ئەو خاڵە کە، وشەی good night بۆ سڵاو کردن کەڵکی لێوەرناگیرێ تەنیا بۆ ماڵئاوایی بەکاری دێنن.

بۆ وێنە هەرکات لە کاتەکانی ئێوارە تا شەو (مەبەست وەختی خەوتن) دەتوانین لە وشەی good evening یان هەر hello کەڵك وەرگرین بەڵام بۆ رۆیشتن یان چوونە ناو نوێن دەتوانین لە good night بۆ ماڵئاوایی کەڵك وەرگرین.

*هەرکات بۆ یەکەمین جار لەگەڵ کەسێك ئاشنا بین دەتوانن لەو ڕستانەی خوارەوە کەڵك وەرگرین.

How do you do?
Pleased to meet you.
Nice to meet you.

باشترین وەڵام لەلایەن کەسی بەرانبەرەوەی:

How do you do?

**٢٥-بەکارهێنانی road- street:**

**وشەی street زیاتر بۆ شەقامەکانی ناو شار بەکار دەهێنرێ کە لە لایەکەوە یان هەر دوو لایەوە ماڵو دوکانو بازاڕ هەیە بەڵام road بۆ ڕێگای نێوان شارو شارۆچکەکان بەکاری دێنن هیچ کات ناتوانین بەرێگای نێوان شارەکان بڵێین street بەڵام دەتوانین بە شەقامەکانی شار بڵێین road.**

## کام وشە :Which Word

لێرەدا هێما بە هێندێك لەو وشانە دەکەین کە واتاکانیان یان هێندێك لە واتاکانیان لەگەڵ وشەیەکی دیکە یەکێکە بەڵام شێوەی بەکارهێنانیان تا رادەیەك جیاوازە.

مەبەست لەوەی کە دەڵێین هێندێك لە واتاکانیان ئەوەیە کە وشەی وا هەیە چەند مانای جیاوازی هەیە کەیەکێك لەو واتایانە لەگەڵ وشەیەکی دیکە یان یەکێك لە ماناکانی وشەیەکی دیکە یەکێکە. وەك وشەکانی as, like کە هەردووکیان چەند واتایان هەیەو هەردووکیان لە واتایەك دا کە (وەکوو)ە یەك دەگرنەوە.

**١-جیاوازی effect, affect:**

وشەی affect فرمانەو واتای (کاریگەر بوون، شوێنەوار دانان) دەدات بەڵام effect ناوە بە مانای (کاریگەر، شوێنەوار) بەکار دەهێنرێ. وەك:

Does television affect children's behaviour?

ئایا تەلەفزیۆن لەسەر هەڵسوکەوتی منداڵان شوێنەوار دادەنێ (کاریگەری هەیە)؟

Does television have an effect on children's behaviour?

ئایا تەلەفزیۆن کاریگەریەکی لەسەر هەڵسوکەوتی منداڵان هەیە؟

## ٢-جیاوازی be = frightened – afraid – scared:

ئەو سێ وشەیە هەر سێکیان مانای (ترسان) دەدەن وشەی scared زیاتر لە قسەکردن بەتایبەت هاوڕێیانە بەکار دێنن و زۆر جار بۆ ئەو جۆرە ترسانە کە کەمن و لە ماوەیەکی کورت دا تێپەڕ دەبن بەکار دێت. وەك:

Dad was driving very fast and we were a bit scared.

بابە ئەوەندە خێرا ئوتومبیلەکەی لێ‌خوڕی کە ئێمە تۆزێك ترساین.

*هێندێك جار دەتوانین لە هەرسێکیان بەو شێوەی خوراەوە کەڵك وەربگرین.

I have never been so frightened in my life.

لە ژیانم دا هیچ کات ئەوەندە نەترساوم.

*لەپێش وشەکانی scared, frightened دەتوانین لە very, too, a bit کەڵك وەربگرین بەڵام لەگەڵ afraidدا ناتوانین.

هێندێك جار لە وشەی about لەگەڵ scared, frightened کەڵك وەردەگرین بەڵام نابێ لەگەڵ afraid بەکاری بێنین. وەکوو:

I'm scared about going to city again.

لەبارەی دووبارە چوونەوە شار دەترسم.

- لەپێش وشەکانی scared, frightened دەتوانین لە very, too, a bit کەڵك وەربگرین، بەڵام لەگەڵ afraid بەکاریان ناهێنین.وەك:

I'm too frightened to ask him now.

من زۆر دەترسم ئێستا لێی بپرسم.

## ٣-جیاوازی permit, let, allow:

ئەم سێ وشەیە بە مانای (ڕێگادان، ئیجازە دان) بەکار دەهێنرێن.

***Let***: زۆر هاوڕێیانەیە لە قسەکردنی ئینگلیزی‌داو بە دوای‌دا کارلێکراو و پاشان چاوگی بێ to بەکار دەهێنرێ. وەك:

Let James sit here. ئیجازەی جیمز بدە با لێرە دانیشێ.

***Allow*** : لە نووسین دا زیاتر allow بەکار دێنن بەڵام لە قسەکردندا هەروەك باسمان کرد let هاوڕێیانە ترە وشەی permit لەهەردووکیان ڕەسمی‌ترەو زیاتر لە پەیوەندی‌یەکان دا بەکاری دێنن هەردوو وشەی permit و allow بە دوایان دا کارلێکراو و چاوگ بەکار دەهێنرێ. وەك:

Some parents allow their children to do whatever they like.

هێندێك لە دایك و باوكان ڕێگای منداڵەكانیان دەدەن چیان پێ خۆشە بیكەن.

I don't permit anybody to smoke in the house.

من بە كەسێك ئیجازە نادەم لە ماڵەكەدا جگەرە بكێشێ.

**سەرنج:**

لە فرمانی let ناتوانین بەشێوەی نادیار كەڵك وەربگرین بەڵام دەتوانین بۆ ئەو جۆرە ڕستانە لە permit, allow كەڵك وەربگرین. وەك:

Customers are permitted to use the car park.

مشتەریەكان ئیجازەیان هەیە لە شوێنی ڕاگرتنی ئوتومبیل كەڵك وەربگرین.

### ٤-بەكار هێنانی lone, lonely, alone:

وشەی alone بەرانبەرە لەگەڵ by yourself – on your own بە مانای (بە تەنیا) ئەم وشانە زیاتر لە قسەكردندا بەكار دەهێنرێن، و شتێك كە جودا لە شتێكی دیكەیە باس دەكات. وەك:

I like being alone in the house. پێم خۆشە بە تەنیا لە ماڵێ بم.

I am going to London by myself next week.

دەمەوێ بۆ خۆم (بە تەنیا )حەوتووی داهاتوو بڕۆم بۆ لەندەن.

I want to finish this on my own. (without anyone's help)

من دەمەوێ بۆ خۆم ئەمە تەواو كەم (بێ یارمەتی كەسێكیتر)

وشەی lone بەرانبەرە لەگەڵ single, solitary بەمانای (تەنیا) بەكار دەهێنرێن بەو مانایە كە تەنیا كەسێك یا شتێك لەوێیە. وەك:

He was a solitary child. ئەو منداڵێكی تەنیا بوو.

All these jobs can now be done by one single machine.

ئێستا هەموو ئەو كارانە دەكرێ تەنیا بە ئامێرێك ئەنجام بدرێن.

A lone car in the park. ئوتومبیلێك لە پارك دا.

**وشەی lonely مانای (تەنیایی، خەمگین) دەدات یان بۆ شوێنێكی چۆل بەكار دەهێنرێ.**

A lonely house. ماڵێكی چۆل.

She was very lonely when she lived in England.

ئەو زۆر تەنیا (خەمگین) بۆ كاتێك لە ئینگلیز ژیانی دەكرد.

## ٥ـجیاوازی reply – answer:

ئەم دوو فرمانە هەردووکیان بەمانای وەڵام دانەوە بەکار دەهێنرێن وشەی answer بۆ وەڵام دانەوە بە کەسێك یان پرسیارێكو یان نامەیەك بەکار دەهێنرێ لە reply یش هەر بەو مەبەستانە کەڵك وەردەگرین بەڵام بە شێوەی خوارەوە لە رستەدا بەکاریان دێنین.

وەك:

I am writing to answer your question.

من خەریکم ولاّمی پرسیارەکانت دەنووسمەوە (خەریکی وەڵام دانەوەی پرسیارەکانتم)

I am writing to reply to your question. هەمان مانای سەرەوەی هەیە.

*هەروەك دەبینرێ بەدوای replyدا وشەی to بەکاردەهێنرێ بەڵام بەدوای answer ناتوانین بەکاری بێنین.

*لەجێگای ئەم دوو وشەیە هێندێك جارو زۆر بە کەمی وشەکانی respondو rejoin- retore بەکار دەهێنرێن.

لە وشەکانی in reply to – in answer to وەك ناو کەڵك وەردەگرین کە مانای (ولاّم) دەگەیەنن. وەك:

I am writing in answer to your letter.

من خەریکم ولاّمی نامەکەت دەنووسمەوە.

## ٦ـجیاوازی like – as :

ئەم دوو وشەی بەمانای (وەکوو) بەکار دەهێنرێن وشەی like لێرەدا زێدەواژەیە لەپێش ناوو جێناو بەکار دەهێنرێ.

He has blue eyes like me. ئەو وەك من چاوی شینی هەیە.

***As***: وشەی پەیوەندیو ئاوەڵفرمانەو بەو شێوەی خوارەوە لە رستەدا بەکار دەهێنرێ.

She enjoys all kinds of music as I do.

ئەو لە هەموو بەشەکانی مۆسیقا وەك من چێژ وەردەگرێ.

*لە قسەکردنی هاورێیاندا زۆر جاران like جێگای as دەگرێتەوە یانی وەك وشەی پەیوەندی یان ئاوەڵفرمان بەکار دەهێنرێ. وەك:

Nobody understands him like I do. هیچ کەس وەك من لێی تێناگات.

## ٧ـجیاوازی ashamed - embarrassed

ئەم دوو وشەیە هەردووکیان بە واتای (شەرم) بەکار دەهێنرێن بەڵام لە چۆنیەتی بەکار هێنانیان دا جیاوازی هەیە کاتێك لە ashamed کەڵك وەردەگرین کە کارێکمان ئەنجام

دابێتو ئەو کارە هەڵە یا خراپ بێت هەرچەند پێشتر زانیبێتمان ئەو کارە کە ئەیکەین هەڵەیە. وەك:

You should be ashamed of yourself for telling such lies.

دەبێ تۆ لە خۆت شەرم بکەی بۆ ئەو درۆیانەی دەیکەی.

*دیارە لەو کاتانەدا کە ڕووداوێکی زۆر گرینگ نەقەومابێ لەو وشەیە کەڵك وەرناگرن.

I am sorry that I forgot to buy the milk. ببورە لە بیرم چوو شیرەکە بکڕم.

*لەو حاڵەتەی سەرەوەدا ناتوانین لە ashamed بەو شێوەی خوارەوە کەڵك وەربگرین.

I am ashamed that I forgot to buy the milk . X (ئەم ڕستەیە هەڵەیە)

وشەی embarrassed کاتێك کەڵکی لێوەردەگرین کە کارێکی بێئەقڵانەمان ئەنجام داوە یان لە بەرانبەر کەسانێکیتردا هەست بە شەرم دەکەین. وەك:

Some women are too embarrassed to consult their doctor about the problem.

هێندێك لە ژنان زۆر شەرم دەکەن تا لەبارەی گرفتەکەوە لەگەڵ پزیشکەکەیان قسە بکەن.

٨-**جیاوازی نێوان awake – awaken – wake up – waken :**

ئەم وشانە بە مانای (هەستان لە خەو) بەکار دەهێنرێن کە زیاتر لە هەموویان لە wake up کەڵك وەردەگرن. وەك:

What time do you wake up every morning?

هەموو بەیانییەك تۆ سەعات چەند (چ وەخت) لە خەو هەڵدەستی؟

*هەروەها بۆ لەخەو هەستانی کەسێك بەو شێوەیە بەکار دەهێنرێ.

The children woke me up. منداڵەکان منیان لە خەو هەڵسان.

*وشەی awake زیاتر لە نووسین داو لە دەمی ڕابردوودا بەکار دەهێنرێ.

وشەکانی awaken, waken بەتایبەت awaken زیاتر لە ئەدەبیات دا بەکار دەهێنرێن. وەکوو:

The prince awakened sleeping beauty with a kiss.

شازادە بە ماچێك لە خەوێکی خۆش هەستا.

*لە وشەی awake دەتوانین وەك ناوەڵناویش کەڵك وەرگرین. وەك:

Is the baby awake yet? هێشتا منداڵەکە بەخەبەرە؟

*دەتوانین لەجێگای ئەم فرمانانە لە get up یش کەڵك وەرگرین. وەك:

Can you get me up at 6:30 tomorrow?

دەتوانی بەیانی سەعات ٦,٣٠ لەخەو هەڵم بسێنی؟

## ٩-جیاوازی وشەکانی at the back – at the rear – behind :

ئەم وشانە بە مانای (لە پشت – لەدوای) بەکار دەهێنرێن.

وشــەکانی at the rear, at the back هماناپــەکیان هەیــە بــەلاّم at the rear ڕەسمی‌ترە. وەك:

Smoking is only allowed at the rear of the aircraft.

سیگارکێشان تەنیا لە پشتەوەی تەیارەکە ئیجازە دەدرێ.(واتە تەنیا لە پشتەوەی تەیارەکە ڕێگا دەدرێ جگەرەکێشەکان، جگەرە بکێشن).

What is that at the back of the fridge? ئەوە چیە لەپشت سەلاجە کەوەیە؟

*لە وشەی behind کاتێك کەڵك وەردەگیرێ کە شتێك بکەوێتەوە پشت شتێکی دیکەوە یان لە پشتەوەی لێی نزیك بێتو هەروەها بۆ بەڕێوەچوونی کارێك بەدوای شتێکی دیکەدا بەکار دەهێنرێ.

Don't forget to lock the door behind you.

بیرت نەچێ دەرگاکە بەدوای خۆت دا داخە.

Who is the girl standing behind Hemn?.

ئەو کچە کێیە لەپشت هێمنەوە دانیشتووە؟

## ١٠-جیاوازی become – get – go – turn:

ئەم فرمانانە وێڕای ئەوەی کە چەند واتایان هەیە هەر کامیان یەکێك لە واتاکانیان (بوون)ە بۆ ئەوەی کەمتر تووشی هەڵە بین پێویستە ئەو ناوەڵناوانە بناسین کە لەگەڵ ئەم فرمانانە دێن:

| Become | get | go | turn |
|---|---|---|---|
| Involved گرفتار گیرۆدە | used to فێر | wrong هەڵە | blue شین |
| clear خاوێن | better باشتر | right ڕاست | sour ترش |
| accustomed فێر | worse خراپتر | bad خراپ | bad خراپ |
| pregnant حامیلە-زگ پڕ | tired ماندوو | white سپی | red سوور |
| extinct قەرزار- نابوود | angry توورە | crazy شێت | cold سارد |
| famous ناودار | dark تاریك | bald کەچەڵ | |
| ill نەخۆش | pregnant حامیلە، زگ | blind کوێر | |

وشەی become لە get ڕەسمی‌ترە بەڵام هەردووکیان باس لە گۆڕینی سروشتو هەستی خەڵك دەکەن.

Go لە گۆڕینە negativeی کاندا بەکار دەهێنرێ.

Goو turn هەردووکیان بۆ گۆڕینی ڕەنگەکان بەکار دەهێنرێن turn بۆ گۆڕینی کەش‌وهەوایش بەکار دەهێنرێ.

۱۱-**جیاوازی except – apart from – besides**:

ئەم وشانە بە مانای (جگە لە، بێجگە) بەکار دەهێنرێن. وشەی besides لە رستەکاندا بەو شێوەیە بەکار دەهێنرێ.

What other sports do you like besides football?

کام یاریانەت جگە لە فوتباڵ پێ‌خۆشە؟

*بەڵام except لە رستەیەك دا بەکاری دێنین کە شتێك لەنێو کۆمەڵێك بێنینە دەرێ بەتایبەت لە رستە هەواڵی‌یەکاندا. وەك:

I like all sports except football.

من هەموو یاریەکم جگە لە فوتباڵ پێ‌خۆشە.

*لە وشەی apart from دەتوانین لە جێگای هەردووکیان کەڵك وەرگرین. وەکوو:

What other sports do you like apart from football?

I like all sports apart from football.

۱۲-**جیاوازی - a bit- a little**:

هەردووکی ئەم وشانە مانای (کەمێك، تۆزێك) دەدەن بەڵام a bit زیاتر لە بریتانیا بەکار دەهێنرێ لە حاڵێك دا a little زۆرتر لە ئەمریکا بەکاری دێنن.

I'll be a bit later home tomorrow / Bretish/.

I'll be a little later home tomorrow / American/.

بەیانی تۆزێك درەنگتر لەماڵێ دەبم.

۱۳-**جیاوازی نێوان close - shut**:

ئەم وشانە هەردووکیان مانای (داخستن) دەدەن بۆ داخستنی دەرك- پەنجەرە- چاو دەمو . . هتد.

زیاتر بۆ داخستن بە توندی یان بەدەنگەوە بەکار دێنرێو هەروەها زیاتر بۆ داخستنی سندووقو جانتا لەم وشەیە کەڵك وەردەگرن.

بەڵام بۆ کاتی داخستنی دوکانو بازاڕ لە هەردووکیان وەك یەك کەڵك وەردەگرن.وەکوو:

What time do the banks close/ shut? چ وەختێك بانقەکان دادەخرێن؟

*ئەمریکایەکان زۆرتر لە closed وەك ئاوەڵناو کەڵك وەردەگرن. وەك:

The museum is closed on Mondays.

مۆزەخانەکە لە ڕۆژانی دووشەممەدا داخراون.

*دەتوانین لە closed لەپێش ناودا کەڵك وەربگرین بەڵام ناتوانین shut بەو شێوەیە بەکار بێنین. وەك:

A closed Window. پەنجەرەیەکی داخراو.

*دەتوانین لە closed لەکاتی داخرانی ڕێگاو فرۆکەخانەکانو ... هتد کەڵك وەرگرین. وەك:

The road is closed because of the snow.

ڕێگاکە بەهۆی بەفرەوە گیراوە. (داخراوە)

--هەروەها close بۆ بەیان کردنی (تەواو بوونی) کۆبوونەوە یان وتوویژ بەکار دەهێنرێ بەڵام شێوازێکی زۆر ڕەسمی‌یە. وەك:

The meeting will close at 10:00

کۆبوونەوەکە سەعاتی ١٠ تەواو دەبێ.

**١٤-جیاوازی نێوان continuous – continual:**

ئەم دوو وشەیە بەمانای (بەردەوام) بەکار دەهێنرێن وشەی continuous باس لە شتێك دەکات کە بێ‌پسانەوە بەرێوەدەچێ بەڵام continual باس لە بەردەوامی دەکات بەڵام بەشێوەیەك کە دووپات ببێتەوە.

We lived in continual fear being discovered.

ئێمە بەردەوام لە ترسی ئاشکرا بوون دا دەژیاین.

He was in continuous employment until the age of sixty – five.

ئەو هەتا تەمەنی ٦٥ ساڵی بەردەوام کاری کرد . (لەسەرکار بوو).

**١٥-جیاوازی نێوان وشەکانی tell – say :**

ئەم دوو وشەیە یەك مانایان هەیە بەڵام شێوەی بەکارهێنانیان لە ڕستەکاندا جیاوازە.

*دەتوانین لەدوای say کارلێکراو بەکار نەهێنین بەڵام هەرکات بەکارمان هێنا پێویستە لە زێدەواژەی to کەڵك وەربگرین. بەڵام بەدوای tell دا ڕاستەوخۆ کارلێکراو بەکار دەهێنرێو پێویستمان بە زێدەواژە نیە. وەك:

Anne said, ''I'm tired.'' ئەنا وتی من ماندووم.

What did he say to you? ئەو چی بە تۆ وت؟

Can you tell me when the movie starts?

دەتوانی پێم بڵێی کەی فیلمەکەی دەست پێدەکات؟

The doctor told me to stay in bed.

پزیشکەکە پێی وتم لەجێگادا بێنمەوە. (پشوو بدەم)

**١٦-جیاوازی نێوان speak – talk:**

ئەم وشانە یەك مانایان هەیە بەڵام talk زیاتر بەکار دەهێنرێ بەتایبەت لە قسەکردن هاوڕێیاندا بەڵام speak زیاتر لە پەیوەندیە رەسمیەکان کەڵکی لێوەردەگیرێ، هەردووکیان دەتوانێ لە زێدەواژەکانی with و to کەڵك وەربگرین دیارە speak to, talk to لە (ئەمریکا) speak with, talk with لە (بریتانیا) بەکار دەهێنرێن.

Could I talk to you about your travel?

دەتوانم لەبارەی سەفەرەکەتەوە قسەت لەگەڵدا بکەم؟

He wants to talk with my friend. ئەو دەیەوێ لەگەڵ هاوڕێکەم قسە بکات.

I would like to speak with your teacher.

دەمەوێ لەگەڵ مامۆستاکەت قسە بکەم.

Do you want to speak to me? دەتەوێ قسەم لەگەڵدا بکەی؟

***بۆ باس کردن لەسەر زمانەکان لە speak کەڵك وەرگیرێ. وەك:**

I have spoken Persian all my life. من هەموو ژیانم بە فارسی قسەم کردووە.

**١٧-جیاوازی نێوان complement – compliment :**

ئەم دوو وشەیە لە نووسین دا تەنیا یەك جیاوازی چووکەیان هەیە ئەویش ئەوەیە کە پیتی نێوان( l وm )ە کانیان لە یەکێکیان دا i و لەوەی تریاندا (e)یە.و هەردووکیان بەیەك شێوە دەخوێندرێنەوە کە بە پێی فۆنتێکی ئینگلیزی " I PA " بەو شێوەیە تەلەفوز دەکرێ

ˈkɒmplɪmənt

بەڵام ماناکانیان بە تەواوی لێك جیاوازە.

وشەی compliment بەمانای (وەسف یان وەسف کردن – تەعریف کردن) بەکار دەهێنرێ بەڵام وشەی complement بەمانای (تەواوکەر) بەکار دێت کە مەبەست لە شت یا کەسە کە تەواوکەری یەکتر بن. وەك:

The team needs players who complement each other.

تیپەکە پێویستی بەو یاریزانانەیە کە تەواوکەری یەکترن.

She compliment me on my English.

ئەو منی لە ئینگلیزیەکەم دا وەسف کرد (بەرز نرخاند) – (ئەو لە ئینگلیزیەکەم دا پێ هەڵدام/لێ کردم)

## ١٨-جیاوازی نێوان وشەکانی convince – persuade :

ئەو دوو وشەیە بە مانای (بە قەناعەت گەیاندن، یان ڕازی کردن) بەکار دەهێنرێن بەلاّم جیاوازیەك لەنێوان ئەو دوو وشەیەدا هەیە.

وشەی persuade کاتێك بەکار دەهێنرێ کە دەتەوێ کەسێك بە قەناعەت بگەیەنێ تا کارێك ئەنجام بدات. وەك:

I tried to persuade her to see a doctor.

تێکۆشام بە قەناعەتی بگەیەنم بچی بۆ لای پزیشکێك. (چاوی بە پزیشکێك بکەوێ)

*بەلاّم وشەی convince کاتێك بەکار دەهێنرێ کەسێك بیهەوێ کەسێکیتر لە باری فیکریەوە بە قەناعەت بگەیەنێ. وەك:

He convinced me he was right.

ئەو منی بە قەناعەت گەیاند کە ڕاستی دەکرد.

*دیارە هێندێك جار لەوشەی convince لەجێگای persuade کەلّك وەردەگرن بەلاّم زۆر بە کەمی ئەو کارە دەکرێ‌و بە وتەی زانایانی ئەو زەمانەوە زۆر دروست نیە ئەو کارە بکرێ.

## ١٩-جیاوازی وشەکانی coast, shore, beach, seaside :

وشەی coast بە (بەستێن) دەڵێن کە بریتیە لە بەشێك لە زەوی کەناری دەریا بۆ وێنە بەشێك لە وڵاتێك کە لە کەناری دەریا دایە.

وشەی shore بەو زەوییە دەڵێن کە لە کەناری دەریا یان چۆم هەڵکەوتووە.

وشەی beach بە مانای (کەناری دەریا) بەکاردەهێنرێ کە خەڵك بۆ سەیران‌و ڕابواردن دەچنە ئەوێ‌و ئەو شوێنە لە (لم) داپۆشراوە.

وشەی seaside زۆرجار بۆ ئەو شوێنە بەستێنانە بەکار دەهێنرێ کە خەڵك بۆ سەیران دەچنە ئەوێ دیارە لەم حاڵەتەدا لە sea یش کەڵك وەردەگرن. وەك:

a seaside resort. سەیرانگایەکی کەناری دەریا

**نموونەکان:**

We live on the coast. ئێمە لە بەستێن ژیان دەکەین.

We camped on the north shore of the lake Michigan.

ئێمە لە باکووری بەستێنی چۆمی (میشیگان) خێوەتمان هەڵدا.

## ٢٠-جیاوازی وشەکانی discover- invent, find out, learn،

ئەم وشانە بەمانای (زانین، تێگەیشتن، دۆزینە) بەکار دەهێنرێن.

لە وشەی invent کاتێك کەڵك وەردەگرین کە تێدەگەین ئەو شتە پێشتر نەبووە یان شتێکی راستەقینە نیە.

Many children invent an imaginary friend.

زۆربەی منداڵەکان هاوڕێیەکی خەیاڵی دەدۆزنەوە.

*وشەی discover کاتێك بەکاردەهێنرێ کە لە بوونی شتێك دڵنیا بین، یان بۆ یەکەمین جار شتێك دەدۆزینەوە. وەك:

Who discovered America? کێ ئەمریکای دۆزیەوە؟

لە وشەی learn کاتێك کەڵك وەردەگرین کە بە خوێندنو لێکۆڵینەوە لە شتێك تێبگەین. وەکوو:

She is very keen to learn about Japanese culture.

ئەو زۆر تامەزرۆی تێگەیشتن لە فەرهەنگی ژاپۆنیەکانە.

*وشەی find out کاتێك بەکار دەهێنرێ کە بەهۆی لێکۆڵینەوە یان بە ڕێکەوت لە شتێك تێبگەین. وەکوو:

When did you find out that she's married?

کەی تێگەیشتی کە ئەو خێزاندارە؟

I saw her husband last week. حەوتووی پێش هاوسەرەکەیم دی.

***

## سەرچاوەکان:


١-گرامر انگلیسی از دبیرستان تا دانشگاه عباس فرزام

٢-انگلیسی قدم به قدم مجتبی مدرسی تهرانی

3- Oxford Advanced Learner's Dictionary

4- English 900 (book six) James J. Hulley

5-Headway (Pre –Intermediate) John & Liz Soars

I don't believe in "habits". A child behaves a certain way for a reason ....... he been frightened by sudden, loud noises in a crowd? Has he ever lost sight of you in a public place?

Do you ....... him to behave in more mature ways than any toddler is capable of? I'd limit "public" appearance as much as possible for a while. If your child ....... put his feeling in would also help to talk about his reaction you ......say, "I know you get sacred when there are a lot of people around." Then reassure him that such fears are normal.

There are a question and an answer to a child's behaviour. His mother asks an expert in child psychology and he replies to her.Read the question and fill each gap in the answer with one of the following.

| can | might | was | are | has |
|---|---|---|---|---|
| expect | be | been | were | taken |

## Public Nuisance

Question – My son is 18 months old and screams every time we go out.

It's embarrassing, people move away from us in restaurants and I've even been told to leave stores in the mall if I can't shut him up. The more I try to quiet him, the louder he yells. How can I break this annoying habit?

Answer – It would help to know how long this behaviour has ....... going on. If it's relatively new, it may ...... The normal reaction of a child who has suddenly become aware of large groups and feels overwhelmed. I think infants ...... exposed to for too much. Stimulation today, and it's no wonder some panic. While I was growing, there ....... no malls and I wasn't ..... to a restaurant until I ..... 10!

The world has changed, but children's developmental schedules haven't.

Most of those objects are kept and displayed in important of the world. For example. "Metropolitan" in America, "British museum" in England.

The ancient cave of Karaftoo is the other famous place. It is located at 74k ms distant from east of Saghez.

## *Answer these questions:*

1- Where is Saghez located?

2- Is Saghez biggest of all Kurdistan cities? (explain)

3- Who were inhabitants of Saghez?

4- Where are invaluable of Ziwieh kept?

Read this article and if you don't know the meanings of words use a dictionary.

## "A nice City in Kurdistan"

Saghez area is one of ten areas in Kurdistan Province which is part of Iranian Kurdistan. Saghez is located in the eastern part of Kurdistan and north west of Iran.

It's biggest the city in the province except "Sina". According to the official census of Iran in 1996, its population was about 120.000. but now its probably over 200.000.



*A view of Saghez*

The root of the word Saghez has along history. It is said that Saghez was capital of "Sakas" Sakas were inhabitants of the land which was Saghez then. It was located on the bank of the Saghez river. But this city is divided now by that river. An

important place in Saghez area is Ziwieh historically ancient hill Ziwieh is located 42 k ms distant from Saghez.

Its objects belong the first millennium BC. It has been excavated by archaeologists.

remained in same responsibility until he was assassinated. Before the fall of Shah's regime Dr. Ghassemlou came back to Iran and began his activity secretly.

After the collapse of the oppressive regime of Shah in a meeting in Muhabad on the 20th November 1979, he declared formal activity of his party. After Shah, people's revolution failed because the new regime began to destroy, ruination and killing the Iranian liberals.

Its law and rule was more worse than the previous regime. Dr. Ghassemlou continued to fight for freedom against brutal Islamic regime.

He was a great economist, politician and intellectual. He know several languages, including: English, French, Arabic, Persian, etc.

Both of the Shah and the Islamic republic have offended Kurdish nation, the reason is that Dr. Ghassemlou and his party have never obeyed cruel government in Iran.

Dr. Ghassemlou was not only highly intelligent, but also was very practical. Freedom enemies had known this fact and they were planning to assassinate him. Unfortunately they succeeded in carrying out their plot, and thus made mournful his party, his nation and all Iranian liberals.

Dr. Ghassemlou was martyred in 1989 but his way continues.

***Answer these questions:***

1) Where was Dr. Ghassemlou born?

2) When was he born?

3) What did he begin his activity with?

4) When did he receive his doctorate and what was his thesis about?

5) Why were freedom enemies planning to assassinate Dr. Ghassemlou?

***Read this article. Find the meanings of important words use of a bilingual dictionary if you don't know their meanings .***



## *A prominent Kurd*

Dr Abdul Rahman Ghassemlou was born in a village of Uromia in 1930.He began his schooling in the same city. Ghassemlou started his activity with "Democratic Youth Union of Iranian Kurdistan" in 1946.

He went to Tehran and continued his education at "Alborzian" high school in 1946.Dr.Gassemlou became a member of "Tuda Party" when he was there. In 1948,he went to France and continued his education at political economics with government's scholarship but a year after that he went to "Czechoslovakia" and continued his high education with Tuda's support for his scholarship was stopped.

In 1951,he went back to Iran and stayed in Tehran Tabriz and Kurdistan cities for a while. Then he went to Iraq. After a while, he returned to Europe. In 1958, he came to Baghdad and taught literature and Kurdish language.

In 1962, he received his Doctorate in Prague and his thesis titled " Kurdistan and Kurd" was printed in London in 1965. At the third congress of Democratic Party of Iranian Kurdistan he was elected secretary general of this party and

# *Zagross English Grammar*

***An Easy Way For Learning English Language***

***Prepared By : Usef Faghehey***